بسم الله الرحمن الرحيم

گولبژێرێک لە ووتارەکانی

م. سید أحمد

ناوی کتێب: گوڵبژێرێک لە ووتارەکانی

م.سید أحمد

ئامادەکردنی: أدریس حامید

دیزاین: کۆمپیوتەری سارا

تیراژ: ١٠٠٠دانە

چاپ: یەکەم

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارەی سپاردنی (١٢٦٠)ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە

# گوڵبژێرێك له ووتارەكانی

## م.سید أحمد

ئامادەكردنی: أدریس حامید

چاپی یەكەم

١٤٣٢ك ٢٠١١ز

## ﴿ووتاری حیكمەتەكانی عیبادەت( ٢ )﴾

ئیمانداره بەڕێزەكان: خوشك و برا شیرینەكان سەلام وڕەحمەتی خوای گەورەتان لێ بێت، لە ووتاری پێشوودا لاپەڕەیەكمان هەڵدایەوە لە لاپەڕە پڕ لە كاكڵەو بەهرەكانی خواپەرستی و عیبادەت، ئەویش فەلسەفەو حیكمەتی ئەوە بوو كە عیبادەت وخوا پەرستی بە هەموو چڵ و پۆپ و بەشەكانیەوە خۆراك و بژێوی ڕۆح و دڵی مرۆڤی ئیمانداره....

وەكو لاشەكەی پێویستی بەو خەوو خۆراك و ئیسراحەت وپشوودان هەیە، دڵ و ویژدان و ڕۆحیشی پێویستییەتی كە ئەویش بریتییە لەو عیبادەتە، لەو ﴿سبحان رب العَظیم﴾ و ﴿سبحان رب الأعلى﴾ لەو نیازش و لاڵانەوەو كزۆڵی و پاڕانەوە بەرامبەر بە خوا، لەو دەرگادانەی ﴿ارحَمُ الراحمین﴾ یە بۆ هەموو كێشەكان و قەیرانەكانی تاك و خێزان و كۆمەڵ و دونیاو ئاخیرەت.

ئێستەش ئەچینە سەر لاپەڕەیەکی تر لە حیکمەتەکانی عیبادەت و خواپەرستی کە ئەویش بە دەستهێنانی بەختەوەری و کامەرانییە، ئەو دوو ووشە شیرینە ناسکە کە.

هەموومان شەیدایینی و تامەزرۆینی و حەزمان لێیەتی و خەوی پێوە ئەبینین، شەو ئەخەینە سەر ڕۆژ و ڕۆژ ئەخەینە سەر شەو بە دوایدا عەودالین و وێلین، ئەوپەڕی هەوڵ و تەقەلا ئەدەین بەڵکو دڵخۆش بین، بەڵکو دڵنیابین، بەڵکو ئاسوودە بین، بەڵکو کامەران بین، بەختەوەربین و هەست بە بەختەوەری ناخ و ویژدان و ڕۆحمان بکەین، خەڵکانێکی زۆر ، کەس نییە حەزی لە سەعادەت وبەختەوەری نەبێت، کەس نییە بە دوایدا شەیدا نەبێ و وێڵ نەبێت، جا هەیە بە دەستی دێنێ و ڕێگەی ڕاست و دروست ئەگرێ، دێتە پێش بۆی، هەیشە زیاتر لە سەعادەت و لە بەختەوەری دوور ئەکەوێتەوەو زیاتر نادان و سەرگەردان ئەبێت لەو بیابان و تەپ وتۆزو چۆڵاییەدا، تافەت و نەهامەت و نەگبەت ئەبێت ڕێگەی پێ ئەگرێ و چۆکی پێ دائەداو ملی ئەشکێنێ و ماڵی وێران ئەکات...

هەموومان بە دوای سەعادەت و بەختەوەریدا وێڵین، بەڵام ئایا هەموو کەس ئەیگاتیێ؟ من ئەڵێم یەك کەس ئەیگاتیێ لەم دنیایەدا، با ئەو کەسە هەژارو نەداریش بێت، با فەقیرو دەردەدارو نەخۆشیش بێت، با سەرتاپا ژیانی نوقوم بوبیێ لە بێزاری و بێتاقەتی و نەداری و داماوی و کلۆڵی دونیادا، ئەکریێ ئەو کەسە لەو حاڵەدا بیگاتیێ، بەڵام کەسێکی تریش لێی مەحروم و بێبەش بێت، با نوقوم بوبیێ لە تەوقی سەری تا بەری پێی لە هەموو جۆرە نازو نیعمەتەکانی دونیا، ئەوەی مرۆۋ حەزی لێئەکاو بە دوایا بگەڕیێ و خەونی پێوە ببینێو هەمووی ببیێ، هەموو ژیانی گەنجایەتی بێت، هەموو گەنجایەتی بەهار بێت، هەموو بەهاری لەش ساغی بێت، هەموو لەش ساغییەکەی دڵخۆشی بێت، هەمووی زەردەخەنەو پێکەنین بێت، هەموو دونیاو ماڵی دونیاش بە دەمیەوە پێبکەنێت، بەڵام وەختی وا هەیە ڕێی لەم سەعادەت و بەختەوەرییە ناکەویێ و وێڵانەو نادانانەو سەرگەردانانە ژیان بەڕیێ ئەکاو بەرەو قیامەتیش بە وێڵی ئەڕوات، بە لاری ئەڕوات، دونیاش بە وێڵی و نادانی

بەجیٚ ئەهێڵیٚ و بە وێڵیش بەرەو قیامەت ئەڕوات بۆ لای خوا، (خوا پەنامان بدات).

ئەکریٚ لەناو ئەو هەموو نازو نیعمەتەدا وێڵ بیٚ و بە حەیاتی لەزەتی لە سەعادەت نەبردبیٚ و نەزانیٚ ئاسوودەیی و ئیسراحەتی ویژدان و ناخ و ڕۆح چییە، بەڵیٚ ئازیزەکانم عیبادەت بە نوێژو ڕۆژو حەج و تەواف و صەدەقەو ئەوەی کە ئەیکەین بە دوعاو تەسبیحات هەموو ئەوە کە پێی ئەوترێت، (مەنظومەی عیبادەت ) و خواپەرستی، بەڕاستی ئەو کلیلەیە وە ئەو نیعمەتەیە ئەو کیمیای سەعادەتەیە کە مرۆڤ ئەگەیەنێتە سەعادەت با شتەکانی تریشی نەبێت، با هەموو گیانی ناتەواویش بیٚ و نەخۆشیش بێت، هەر ئەیگەیەنێتە ئەو سەعادەتە کە فەیلەسوف و زاناو داناو سیاسەت مەدارو دەستور دانەران و موصلیحەکانی ناو کۆمەڵگاو ژیان و ژیار خەریکی ئەوەن کە خەڵك بەرەو ئاسوودەیی بەرن و بەڵکو مرۆڤ بگەیەننە ئەم ئاسودەیی و ئیسراحەتە، بیگەیەننە کامەرانی و مرۆڤی موسوڵمانان ئەیگاتیٚ، بەمە کە مرۆڤ نوێژ دائەبەستێت پشت ئەکاتە

شەیتان و ئەڵێت:﴿أعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَیطانِ الرَجیم﴾ ڕوو ئەكاتە خواو ئەڵێت:﴿بِسْمِ للهِ الرَحمنِ الرَحیمْ﴾ هەر لەو كاتەوە ئەگەر تێبگات چی ئەڵێت، ئەگەر تێبگات بەرامبەر كێ ڕاوەستاوە، ئەگەر تێبگات چ پەیمانێك مۆر ئەكات لەگەڵ خوادا، بە ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ ئەگەر بزانێ قسە لەگەڵ كێ ئەكات و كێ گوێ ی بۆ گرتووە، ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ، مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ ئەگەر بزانێت چ گەشتێك ئەكات بە ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ وە بزانێ چی ئەڵێت ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ نمایندەو نوێنەری كێیەو بە ناوی هەموو كەونەوە قسە ئەكات و كە ناڵێ ﴿إِيَّاكَ اعبُدُ﴾ ئەڵێت ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ ، ناڵێت ﴿إِيَّاكَ اسْتَعِينْ﴾ ئەڵێت: ﴿إِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ ، بە ناوی هەموو كەونەوە قسە ئەكات،ناڵێت﴿ ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾

ئەڵێت: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ ، ئەڵێت: {اللهُمَّ أهدينا فِيمَن هَدَيتْ وَ عافِنا فِيمَن عافَيتْ وَ تَوَلَنا فِيمَن تَوَلَيتْ} بەناوی هەموو ئەو گەردون و ئەم بەشەریەتەوە قسە ئەكات، ئا لەو كاتەیا ئەگەر بزانێت چی ئەڵێت، ئەگەر وەكو پێشینانی خۆمان بزانێت چی ئەڵێ و چی ئەكات، هەر لەو سەعاتەوە ئەكەوێتە ناو دەریای سەعادەت و بەختەوەری و كامەرانی هەر لەو لەحزەیەوە، بەڵام كە ئەڵێت : ﴿سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَ﴾ یانی من خوا گوێم بۆ ئەگرێت، لەبەر ئەوە ئەڵێت ﴿رَبَنا وَلَكَ الحَمد﴾ كەسێك خوا گوێی بۆ بگرێت، كەسێك قسە لەگەڵ خوا بكات، كەسێك خوا قسەی بۆ بكات، ئەو كەسە بۆ ناگاتە كامەرانی، ئەگەر تێ بگات ئەڵێت چی، ئەو كەسەی كە بانگ ئەداو ئەڵێت: ﴿اللهُ أكبَرْ﴾ ئیعلانی ئازادی مرۆڤ ئەكات و ئەڵێت هەر یەك گەورە هەیە لەم بونەوەرەدا لەم ژیان و ژینەدا، ئەویش ﴿الله﴾ یە، هەمووی بچووكەو هەمووی خاك و خۆڵەو ﴿وَكُلُ ما فَوقَ التُراب تُرابْ﴾ ئەگەر ئەم بانگ بێژە بزانێت چی ئەڵێت، ئەم نەشیدە خواییە كە

مەلائیکەو چیاو ئەرزو ئاسمان و هەورازو نشێوو بە سەمفۆنیایەکی ئاسمانی و ئیلاهی لەگەڵ بانگ بێژا ئەڵێن:

﴿اشْهَدُ أن لا إلهَ إلا الله وَ اشْهَدُ انَ مُحَمَدَ رَسولُ الله﴾

ئەگەر ئەو بانگ بێژە بزانێ چی ئەڵێت، ئەگەر ئەو کەسەی کە ڕکوع ئەبات بۆ خواو ئەڵێت: ﴿سُبحانَ رَبي العَظيمْ﴾ وە کە ئەڵێت ﴿سُبحانَ ربيَ الأعلى وَبِحَمْدِهِ﴾ لەگەڵ خوا تێکەڵە، ﴿سَجَدَ وَجهى وَ سَمعى وَ بَصَرى مُخي وَ عَظمي وَما أستَقَلَت ، إستَقَرَت به قَدَمي﴾ خوایە هەموو گیانم سوژدە بۆ تۆ ئەباو قسە لەگەڵ تۆ ئەکا و داوا لە تۆ ئەکاو لە دەرگای تۆ ئەداو ڕجاو تکای تەنها بۆ تۆیە، هەموو دەرگاکانی داخستووە تەنها دەرگای تۆ ئەکاتەوەو هەر لە دەرگای تۆ ئەدات، چونکە هەمووی خەوتوون، هەمووی بێئاگان، هەمووی هەژارن، هەمووی نەدارن، هەمووی داماون، هەمووی کزۆڵن، هەمووی کلۆڵن، ئیللا تۆ نەبیت، کاتێك ئەمانە تێبگاو ئەمانە بکات، ئەرێ کاکی خۆم بۆچی ناگاتە لوتکەی بەختەوەری و بۆ ناگاتە کامەرانی، بۆ ناگاتە ئاسوودەیی، ﴿الا بِذِكْرِ الله

تَطمَئِنَ القلوبْ﴾ بەردەوام ﴿لايَزالُ لِسانه رَطباً بِذِكرِ لله﴾ ئەوە ئەگاتە بەختەوەری...

کەوابیٚ ئازیزەکەم خوشك و برای شیرینم بۆیە دیٚ ی بۆ مزگەوت بۆ ئەم ڕاستییە، حەقیقەتەی تیٚبگە کە ئاسوودەیی و بەختەوەری، کامەرانی و هاوچەمکەکانی لە (عبودیەت)دا دەست ئەکەویٚت، وە (عبودیەت) ئەو خیٚرە پیٚشکەش بە ئیٚمە دەکات، (عبودیەت) فیٚرمان ئەکات چۆن ئاسوودە بین، کامەرانیمان پیٚشکەش ئەکات، خەڵات و هەدیەی ئەم عبودیەت و ڕکوع و سجودە، لەلایەن پەروەردگارەوە کامەرانییە، ئەوەی کە کاتی خۆی فەقیرو هەژارەکانی باوو باپیرانمان کە زۆر نەدارو داماو بوون، ئەوەندە گەیشتبوونە لوتکەی بەختەوەری و کامەرانی، ئەیانوت ﴿وَلله لَو عَلِمَ الملوكِ وَ ابناءُ المُلْكِ ما نَحْنُ فِيهِ لَجالِدُنا عَلَيهِ بجدالسيوف﴾ سویٚند بەخوا ئەگەر پادشاو بەچکە پادشاو دەوڵەمەندو پیٚکەوتووەکان بیانزانیایە کە ئیٚمە لە چ خۆشی و لەزەتیٚکداین لە ڕۆح و دەرون و گیانمان، بە شمشیٚر لیٚیان ئەسەندین و لیٚیان داگیر ئەکردین بۆ خۆیان، کەسیٚك نەوت

داگیر ئەکات، کەسێك زێڕ داگیر ئەکات، خاك داگیر ئەکات، خەڵك داگیر ئەکات، ئەگەر بیزانیایە ئەهات ئەوەی لە ئێمە ئەسەند، چونکە ئەوە لەوانە زۆر خۆشترە، هەندێ ئەڵێن و(الله)ی لە حاڵەتی وادا ئەژیم، ئەگەر ئەهلی بەهەشتیش لەو نازو خەڵاتەدا بژین، بەڕاستی لە خۆشیدان، هەندێکی تر وتوویانە: و(الله)ی لەم دنیایەدا شتێك هەیە هەرکەسێك پێی تێنەخات و نەچێتە ناوی و نەچێتە ئەو قاعەیەو ئەو بەهەشتەی دونیا، ناچێتە بەهەشتی ئەو دونیاش، وتوویانە باشە ئەوەی کە تۆ ئەیڵێی چییە؟ وتوویەتی: سەعادەتی دەروونییە، ئەوەیە کە هەست بکەی کە خوات لێ ڕازییە، هەست بکەی لە خوا ڕازیت.﴿رَضيَ اللهُ عَنهُمْ وَرَضوا عَنْه ذلِكَ لِمَنْ خشيَ رَبَه﴾ ئەو کەسەی کە لە خوا ئەترسێت، ئەو کەسەی کە ئەزانێت لەگەڵ ئەم کەونەدا لە سازگاریدایە، لە تەبایدایە، لە تەیاریدایە، لە نەیاریدا نییە، لە دژایەتیدا نییە، لەگەڵ ئەم کەونە بە یەك کەڕەت ئەڕوات، بەرەو خوا ئەڕوات، ﴿وَإذا سَأَلْتَ فسأل للهِ﴾ ئەو کەسەی کە باش ئەزانێت کە ئەم عیبادەتە ئەمانەتی خوایە.﴿إنا عَرَضْنا الأمانَةَ عَلى السَمواتِ

وَالأرضِ وَالجِبالِ فَأبَيْنَ انْ يَحمِلنَها وَ اشْفَقْنَ مِنها وَحَمْلَها الأنسانْ﴾

ئێمە ئاوا ئەو ئەمانەتەمان هەڵگرتووە، عەقد و گرێبەستە لە نێوان بەندەو خوادا، ئەو ئەمانەتەی خستووەتە سەرشان و ئەستۆی ئێمە، ﴿إنّا سَنُلْقي عَلَيْكَ قَولاً ثَقيلا﴾ ئەمانەتێكی وەها گرانە .

﴿لَوْ اَنزَلْنا هذا القُرآن على جَبَلٍ لَرَأَيتَهُ خاشِعاً مُتَصَدِعاً مِنْ خَشيَةِ للهِ﴾ ئەو قورانە ئەو دین و ئەو ئەركەی كە پێی ئەوترێ عبودیەت و بەندایەتی عەقدی بەندایەتی ئولوهیەت لە ئاسمان، عبودیەت لە زەوی ئەم عەقدە ئەمانەتە، و(الله)ی هەركەسێك ئەمانەتی خوا بپارێزێت، خواش ئەمانەتی ئەو ئەپارێزێت، یەكەم ئەمانەت كە خۆتی، گیرفانتە، دڵتە، ویژدانتە، نانتە، منداڵتە، ئەو كەل وپەل و قاصەو پارەیە، ئەو سومعەو كەسایەتییەی كە هەتە، ئەمە هەمووی ئەمانەتە، ئەگەر تۆ ئەمانەتەكەی خوا بپارێزیت، خوای گەورەش ئەمانەتەكەی تۆ ئەپارێزێت، ئەمە ڕاستییەكی زۆر گەورەیە زۆر ئاسان و سادەشە .

یەك نمونەتان بۆ ئەگێڕمەوە، لەوانەی كە ئەم حەقیقەت و ڕاستییەیان هەست پێكردووەو تامیان چەشتووەو هەستیان بە تام و چێژەكەی كردووە لەناو ناخ و ویژدانیان:

دەشتەكییەك ، پیاوێكی دەشتەكی - لادێیی تازە موسوڵمان هاتە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ لەو كاتەدا پێغەمبەری لێ نەبوو، بەڵام پڕ بوو لە صەحابە، هەروا سەیریان كرد تا ئەو پیاوە لەسەر ئەسپەكەی دابەزی و ئەسپەكەی هەروا لە دەرەوەی مزگەوت بەجێ هێشت، تا دەست نوێژێكی جوانی گرت و نوێژێكی كرد، بە شێوەیەك كە خوا ئەیەوێت، وە پێغەمبەر فێری كردبوو ﷺ ، ئەوجا دەستی بەرز كردەوەو دوعایەكی پڕ لە ترس و فرمێسكی كرد، پاشان كە هەڵسا هاتە دەرەوە، تەماشا ئەكات وڵاخەكەی نە ماوە كە پێی هاتبوو بۆ مزگەوت، ئەوجا دەستی بەرز كردەوەو ووتی: ﴿یارَبي إني اَدَیتُ اَمانَتَكْ فَأینَ اَمانَتي﴾ خوای گەورە من ئەمانەتەكەی تۆم بەجێ هێنا ئەی تۆ ئەمانەتەكەی منت چی لێكرد؟ كوا ئەمانەتەكەم خوایە؟

ئەفەرموێت: لەو مشت و مڕەدا بووین، هەر تەعەجوبمان ئەکرد و سەرمان سوڕ ئەما ئەو نوێژە جوانە ئەو دوعا جوانە، ئەو فرمێسکە ڕێك و پێك و گەرم و گوڕانە، ئەو ڕێك و پێکی و پابەندییە، ئەو خۆشەویستییە لەگەڵ خوا، کە هاتینە دەرەوە سەیر ئەکەین ئەمە جێی سەرسوڕمان بوو کە ئەسپەکەی نەمابوو، ئەمجا لەم مەسەلەیە عەجایەب تر ووتی: ئەریٚ خوایە من ئەمانەتەکەی تۆم پاراست ئەی بۆچی تۆ ئەمانەتەکەی منت نەپاراست؟ ئەفەرموێت لەم مشت و مڕو حیکایەتەدا بوون، کاتێکمان زانی کەسێك ئەسپەکەی ڕائەکێشا هێنایەوەو ووتی: ئەریٚ کاکە ئەمە هی کێیە هی جەنابت نییە، کێیە خاوەنەکەی؟ تەسلیمی دەستی کردەوە، ئەفەرموون سەرمان سوڕما ووتمان ئەوەیە ئیمان و یەقین، ئەی بەندە خوا مافی بپارێزە خوا تۆ ئەپارێزیٚ و هەمیشە لەگەڵتایە، لە ڕەگی بناگوێت نزیکترە، کە ئەڵێی ئەبیستم دێت بە هاوارتەوە، کە ئەلێی ﴿تَوَكَّلْتُ على الله﴾ پشت ئەگری بە خوا، خوای گەورە پارێزەرو حیمایەتە لە سەیارە لێخوڕین،

لە چوونە دەرەوە، لەسەفەر، لە ماڵ، وە لە ژوورەوە، لە ئاسمان:﴿سُبحانَ الذی أسری بِعَبْدِهِ لَیلاً﴾ لە وێش ﴿فَأوحی إلی عَبْدِهِ ما أوحی﴾ لەوێش هەر عەبدی خوای، خوا هەر محامی و شورەو پارێزەرتە، ئەگەر کەسێك خوا حیمایەی بێت، هەرگیز زەرەر ناکات، ئەگەر لێرە شتێکی لێ بزر بوو، لەولا بۆی قەرە بوو ئەکاتەوە، ئەگەر زەرەرێکی بچکۆلەی لێ کەوت، خوا بەڵایەکی گەورەتری لەسەر لا ئەبات، ئەمە دڵێ مرۆڤە لەگەڵ خوا، کە ئەم عەقدەی کردووە، ئەمە موسوڵمانە کە ئەم ڕاستییانە ئەزانێت، ئەمە شەرت نیە فرۆفسیۆر بیت و دکتۆراو شەهادەی پان و درێژت هەبێت، ئینجا لەمە تێبگەی، نەخێر ، ئەکرێت جوتیارێکی دەست قڵشاوی نەخوێندەوار لەم فەلسەفە کەونیە حاڵی ببێ و تێبگات، بەڵام ئەکرێت پرۆفسیۆرێکی وێڵی سەرگەردان و عارەق خۆرو سەرخۆش ئاگای لەمە نەبێت، هەتا خۆشەویستەکانم خەڵك ئەچێت خۆی سەرخۆش ئەکات بە خەیاڵێ نا موبارەکی خۆی بە دوای سەعادەتا ئەگەڕێت، ئەچێت تلیاك و موخەدیرات ئەکات بە دەردی وا ئەزانێ لە

وێیە، ئەچێت ڕەقص و سەما ئەكات و گیرفانی خۆی هەراج ئەكات، بیتاقە ئەبڕێ بە بیست و پێنج هەزارو خوا لە خۆی توڕە ئەكات، شەریكەی كافرو عەرەقی جولەكە دەوڵەمەند ئەكات، میللەتی خۆی هەژارترو نەدارتر ئەكات لەوەی كە هەیە، ئەوە بەخەیاڵی خۆی ڕەقص و سەما ئەكات و خۆی سەرخۆش ئەكاو خۆی بێ عەقڵ ئەكات، بە دوای بەختەوەریدا ئەگەڕێت، شتێكی لێ بزرە لە مەلهاو لە پارە خەرج كردن و دین دۆڕاندن و دینار دۆڕاندن، لەوێ بۆی ئەگەڕێت، نایێ ڕو بكاتە خواو بڵێ: ﴿اللَّهُ أكْبَرْ﴾ نایێ سوژدە ببات بۆ خواو بڵێت، ﴿سُبحانَ رَبي العَظيمْ﴾ ﴿سُبحانَ ربيَ الأعلى وَبِحَمْدِهِ﴾

ئەچێت لەگەڵ (أدنى ) پەیوەندی ئەبەستێت نەك لەگەڵ (أعلى ) ئەچێت لەگەڵ (حەقیر) لەگەڵ بچوك نەك لەگەڵ عظیم ئەوجا ئەیەوێت بەختەوەر بێت، ئەیەوێت باران ببارێت، ئەیەوێ قات و قڕی نەبێت، ئەیەوێت ووشكە ساڵی نەبێت، ئەیەوێت دونیا جادەی تەخت بێ و ئەفەندی پیا بڕوات،

نەخێر، هەتا بەهۆی ئەو گوناه و تاوانانەیەوە خوا غەزەبی لیّ گرتووین، دوعای چاکەکانیش قەبولّ ناکات .

بەلّیّ ئازیزان: ئەوە بەشێکی کەمە لە فەلسەفەو کاکڵەو بەهرەی عیبادەت و خواپەرستی، عیبادەتی ئێمە تەنها جێبەجیّ تەنفیزی ئەوامیر نییە، تەنها (أمرتُ نَهیتُ . سَمعتُ وَأطَعتُ ) نیە ، لەوەش گەورەترە کە بۆخۆی ئەوە ڕیسالەیەو پەیامە، کە خوا بڵێت: عەبدەکە بیکە بەدڵیّ خوا گیان، بەڵأم لەوەش گەورەتر لەزەت وەرگرتنە، خۆ دۆزینەوەیە، تام و چێژێکی تایبەتییە کە بە دڵ وەرئەگیرێت، جیهازێك هەیە، ئەگەر ژەنگاوی و دوکەڵاوی و چڵکن و نەخۆش نەبێت، باش لەوە تێئەگات، ئەو جیهازە پێی ئەوترێت دڵ، پێی ئەوترێت ڕۆح، پێی ئەوترێت گیان، قیمەتی من وتۆش بەو ڕۆح و گیانەیە، نەك بە لەش و لارو شان و شەوکەت و تاج و نەجمەمان، نەخێر بەوەیە بەوە وەرئەگیرێت ئەوە ئەو لەزەت و تام و چێژە وەرئەگرێت، ئەگەر هەمان بێت، بەڵأم ئەگەر سیس بیّ و تۆرابیّ، ئەگەر دۆڕابیّ، ئەگەر نەخۆش بێت، ئەگەر مردبێت، ئەگەر خەوتبێت، ئەگەر بەنج بێت ئەگەر

بێئاگا بێت، ئەگەر سەرخۆش بێت، بە کوردییەکەی لە هەردوو جەژنەکە ئەبین، بەجارێ ماڵی وێرانم ئەمیشم ڕۆ ئەویشم ڕۆ، بەجارێ ماڵی وێرانم، نە وەکو سەرگەردانەکان لەشمان فێر ئەکەین، نە وەکو صاڵحەکان و موسوڵمانە پاکە چاکەکانیش ویژدان و ناخ و ڕۆحمان فێر ئەبێت..

خۆشەویستەکانم: عیبادەت ئەمانەتی خوایە، ئێمە زۆر پێویستمان بە خوا هەیە، مەگەر یەکێك وێڵ بێت، بەنج بێت، بێ ئاگا بێت، خەوتوو بێت، زیندوویی بەسەر بەڵام بەڕۆح مردوو بێت، مەگەر زیندوێ بێت جێگەی زیندووی گرتبێت لە ڕاستیدا مردبێت، ئەگەرنا ئێمە زۆر پێویستمان بەخوا هەیە، لەهەر چاو تروکانێکا هەرکە سەیارەکەت لێ ئەخووڕی ئەچیتە دەرەوە، ئەگەڕێیتەوە، کە هەنگاوێك ئەنێی کە هەناسەیەك هەیە سەروخوار ئەکات...

وەکو ووتمان: لە هەموو شتێکا پێویستمان بەخوا هەیە، لەبەر ئەوە تەنها لە خوا داوا بکە، ئومێدت هەبێت هەموو خەت و داوەکان بپچڕێنە، هەموویان پەیوەست بکە بە(الله)وە دونیاو ئاخیرەتت بەختەوەر ئەبێت، هەتتا لەزەت لە

موصیبەتیش ئەبەی، لەزەت لە بەڵاش ئەبەی، لەزەت لە نەخۆشیش ئەبەی، چۆن لەزەت لە نەخۆشی نابەی، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتا محاسەبەی عەبدەكانی ئەكات ئەفەرموێت: بەندەكەم من نەخۆش بووم بۆ نەهاتی بۆ لام؟ عەبدەكە ئەڵێت: یا ڕەببی خوایە، تۆ چۆن نەخۆش ئەكەویت؟ ئەفەرموێت والله ی فلان بەندەی برادەرو نوێژكەرت، هاوسێت نەخۆش بوو، ئەگەر بچوویتایە بۆ لای ئەو، من لەویٚ ئامادە ئەبووم، من لەلای نەخۆشەكەم، كە نەخۆشەكە ئەفەرمویٚ و ئەڵێت: ئای، وای ، بێتاقەت ئەبیٚ و وەكو ئەوە وایە بڵیٚ: ﴿اللهُ أكبَرْ ، لا إلهَ إلا الله ، سُبحانَ الله﴾ وەكو قورئان خوێندن وایە، خوا بە عیبادەت بۆی ئەنوسێت.

موسوڵمان كە ئەم هەستەی هەبوو، بە هەموو شتێك ئەڵێت: ﴿كُلُ ما يَأتي مِنَ المَحبوب مَحبوبٌ﴾ هەرچی لەلای خۆشەویستەوە بێت، ئەویش خۆشەویستییە، جا فەقیرییە، هەژارییە، پیرییە، نەدارییە، كزۆڵییە، كلۆڵییە، بابیٚ لەلای خۆشەویستەوە هاتووە، ئەو دیاریەی كە لەلای خۆشەویستەوە دێت بێگومان دیاریەكی شیرینە، دیاریەكی

بەرزە، دیارییەکی گەورەیە، ئەمە دونیایەکی ترە، ئەمە دونیای غەیری سەماو دینارو درهەم و حەرام خۆری و تەزویرو پاشقول لەیەك دان و پشتی یەك شکاندن و درۆکردنی سیاسی و درۆکردنی مۆدێرن و میللەت قوڕبەسەر کردن، ئەوە دونیایەکی ترە، ئەوە دونیای شەیاتینە، ئەمە دونیای ڕەحمانە.

ئەبێ ئێمە دڵێکمان بۆ دروست بێت کە لەم دونیایە تێ بگەین، جیهازێکمان بۆ دروست ببێت لەناخ و ویژدانمانا بزانێت ئەم بەهرانە ڕابکێشێ و بیچنێتەوە بۆ خۆی، ئەگینا ئەمرین و بە ماڵوێرانی و قوڕبەسەری..

خۆشەویستەکانم: نموونەیەکی تر لە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ ، عائیشە ئەفەرموێت کە خێزانێکی زاناو داناو بلیمەت و فەقیهە، نیوەی دینی ئیسلام لە عائیشەوە وەرگیراوە، ئەم کەسە هەناسەی پێغەمبەرﷺ شارەزا بووە، شتی شەو وڕۆژی نەبووە کە شارەزای نەبێت، یا عائیشە ئادەی باسی پێغەمبەرمان بۆ بکە ﷺ.

لە دیمەنێكدا بۆمان باس ئەكات (بالصورة الحيّة) ئەفەرموێت: ﴿كانَ رَسولَ اللهِ ﷺ يَحدثُنا وَنَحدثُه ، فَاذا حانَ وَقتُ الصَلاةِ فَزِعَ إلَيها﴾ نافەرموێت: ذَهَبَ إلَيها، فَزِعَ إلَيها، كانُهُ لا يَعرِفنا وَلا نَعرِفُهُ (صَلَى عَلَيكَ اللهُ يا عَلَمَ الهُدى، مالا برق في السماءِ دليلٌ﴾ ، عائيشە ئەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لەماڵەوە دادەنیشت، وەكو هەر مێردێك لەگەڵ ماڵ و منالْ و خێزانی، پێئەكەنی و قسەی خۆشمان ئەكرد، نانمان ئەخوارد، سوعبەتمان ئەكرد، باسی ئەم دونیایەمان ئەكرد، بەڵام كە وەختێك گوێ ی لە (اللّه أكبر ) ی بیلال ئەبوو، كە وەختی حەققی خوا ئەهاتە پێشەوە، كە وەختی باسی خواو باسی مافی خوا ئەهاتە پێشەوە، دەرئەچوو بە هەڵەداوان وەكو كەسێك ژنیّ بیّ جگەرگۆشە چۆن ئەیفرێنن ئاوا،(فَزِعَ إلَيها ) بە پەلە بەرەو مزگەوت ئەچوو، وا ئەڕۆی كە وەكو نەقسەی لەگەڵ ئێمە كردووە، نە ئەماننناسیّ و نە ئەیناسین، تەواو غائیب ئەبێت لە دونیا پێشوازی دا ئەخاو ڕوو ئەكاتە خوا، نوێژ ئاوا ئەكرێت هاتن بۆ مزگەوت ئاوا ئەبێت، دینداری ئاوا ئەبێت، ئەگەر مرۆڤ كاتێك دێت بۆ مزگەوت

نەزانێت بۆچی دێت، نەزانێت نوێژ بكات، نەزانێت ئەڵێ چی، ئەم وەعدە گەورەیە ئەدات، ئەگەر سەلیقەی بێت یان نایدات، یان ڕاست ئەكات، ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾..

جەعفەری صادق : ئەڵێن كە دەست نوێژی ئەگرت ئەچووە سەر بەرماڵەكەو ڕوو بەقیبلە دائەنیشت، ڕەنگی زەرد ئەبوو ئەلەرزی ، ووتیان: یا ئیمام بۆچی وا ئەكەی ؟ فەرمووی: ئاخر ئێوە نازانن من ڕوو ئەكەمە كێ، نازانن من ئێستە ئەچمە میوانی كێ، لە دەرگای كێ ئەدەم، قسە لەگەڵ كێ ئەكەم، كێ گوێم بۆ ئەگرێت، كێ بەرامبەرم ڕاوەستاوە، نازانن ، خوا، من ئەچم بۆ ماڵی خوا، غائیب ئەبم لە ئێوەو لە دونیا، ئاوا نوێژ ئەكرێت، ڕەنگت زەرد بێت، بلەرزی، پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو بە بیلال بانگ بڵێ ئیسراحەتمان پێ ببەخشە، ئاسوودەمان بكە، بەختەوەرمان بكە، كە نوێژ ئاسوودەیی و بەختەوەرییە، ئەیفەرموو:﴿وجعلت قرّتَ عَيني في الصَلاة﴾ نووري چاو و ئیسراحەت و فێنك بونەوەی دڵ و خۆ دۆزینەوە لەناو نوێژدایە، دونیام بۆیە خۆش ئەوێت كە نوێژ بكەم، من لە نوێژدا خۆم ئەدۆزمەوە، من لە نوێژدا

هەست بە ئاسوودەیی ئەكەم، ﴿هُوَ الذي أنزَلَ السَكينةَ في القلوبِ المؤمنينْ لِيَزدادوا إيماناً مَعَ إيمانِهِمْ﴾ .

ئازیزەكانم: دونیایەكی تر هەیە، پێی ئەڵێن: سەكینەت ، سەعادەت، خۆشەویستی و پەیوەندی لەگەڵ خوای گەورەدا، ڕەزامەندی (الله ) ، ڕازی بوونی خوا، كۆمەك و یارمەتی خوا، خۆشنوودی خوا لە تۆ، ئەوە چ دەستكەوتێكە، چ بازرگانییەكە، لە هەموو دونیاو ئەوەی لە دونیادا هەیە گەورەترە، بەس داخەكەم كڕیاری نییە، بەس لێزانی نییە، بەس سۆزی نییە، خوای گەورە عەرزی كردووە شەو و ڕۆژ بەرگای ڕەحمەتی كردووەتەوە دایناخات، ئەم هەموو فیسق و فجورە ئەبینێت، تەحەمول ئەكات لەبەرخاتری چاكان و پاكان كە وتویانە : (لو خكیت لَقُلِبَت ) ئەگەر ئەو سەر زەوییە خاڵی بوایە لە پیاوی باش و ژنی باش و گەنجی باش و عالمی باش و پیای باش ژێرەو ژوورم ئەكرد، وەكو قەومی لوطم لێئەكردن، چونكە قەومی لوط بە هەموو تەمەنیان بە ئەندازەی هەفتەیەك گوناه، وەكو ئەم خەڵكی ئێمە گوناه ناكات، ئەوەندەی عارەق لەم دەڤەروكوردستانەی

ئێمە خوراوەتەوەو ئەخورێتەوە، ئەوەندە باران بباریایە هەرچی ئاژەڵ و مەڕومالات و دارو بەرد هەبوو هەمووی ئاوی ئەخواردەوە، ئەوەندەی پارە دۆڕاوە لە قومارا، بدرایە بە فەقیرو هەژار، ئەوەندەی بلیت ئەڕوات بۆ تووڕە کردنی خوا، بۆ داخستنی دەرگای ڕەحمەتی خوا لە ئاسمان و نەبارینی باران، چەند بلیتی بیست وپێنج هەزاریو دە هەزاری و سەد هەزاری ئەوەندەی ئەو پارەیە کۆبکرایەتەوە، یەك هەژار لە کوردستانا نەئەما.

یاڕەبی خوایە بۆ خاتری ناوە جوانەکانت و ناوە پیرۆزەکانت بە کردەوەی پیس و چەپەڵی خۆمان لەگەڵ نەکەی، دەرگای ڕەحمەتی خۆتمان لێ دامەخە خوایە، خوایە زیاتر ڕەحمەتمان بۆ ببارێنی تا هەموو رەحمەتەکانی پێ ڕەشێ بکەینەوە، خوایە بۆ خاتری ناوە پیرۆزەکانت زیاتر دەرووی خێرمان لێ بکەیتەوە.

## ﴿ووتاری یادی مەولوودی پێغەمبەر (ﷺ) ......﴾

﴿الحمدُ لله ربِ العالَمين نَحْمَدُهُ وَ نَشكُرُهُ وَ نَستَعينهُ وَنَستَهديهِ وَ نَستَغفرُهُ وَنَعوذُ باللهِ مِن شرورِ أنفُسِنا وَمِن سَيئاتهِ أعمالِنا وَفِتَنِ زَمانِنا مَن يَهدِهِ للهُ فَلا مُضِلَ لَهُ وَمَن يُضلِل فَلا هاديَ لَه ... أشهَدُ أن لا إلهَ إلا اللهُ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَه الكَبيرُ المُتَعال ذوالجلالِ وَ العَظَمَةِ والأكرام .. لا إلهَ إلا هُوَ المَلِكُ العَلام بقول سُبحانَهُ وَ تَعالى وَهُوَ على المؤمنين خاصه وَ على البَشَرية عامة بأرسالِ محمد ﷺ البَرية إلى البَشَرية الى يوم الدين .. يقول عز من قال { لَقَد جاءَكُمْ رَسولٌ مِنْ إنفُسِكُمْ عَزيزٌ عَلَيهِ ما عَنهُم حَريصٌ عَلَيكم بالمؤمنينَ رَؤَفُ رَحيمْ } . وَ أشهَدُ أنَ سَيدَنا وَنورُ أبصارِنا وَ شَفيعُ ذنوبِنا مُحَمَداً عَبدُهُ وَ رَسولهُ .. صَلَواتُ رَبي وَ بَرَكاتُهُ عَلَيهِ وَعلى آلهِ الأطهارِ وَ صَحبِهِ االبركة الأخيار يقولُ صَلَواتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيهِ في بَعثَتهِ وَرِسالَتِهِ وَ وَظيفَتِهِ في الحَياةِ وَالأحياء... { إنَما بُعِثتُ لِأُتَمِمَ مَكارِمَ الأخلاق } وَ يقولُ عَلَيهِ الصَلاةُ وَ السَلام { إنَما أنا رَحمة وَ مهداة } ..

موسوڵمانە بەڕێزەکان:. خوشك و برا ئیمانداره‌کان، سەلام و ڕەحمەتی خوای گەورەتان لێ بێت، هەموو ساڵێ

لەم مانتگەدا کە پێیٚ ئەوترێت مانگی بەهاری یەکەم (ربیع لأول ) موسوڵمانان هەست بە دڵخۆشی و دڵگوشادی و بەختەوەری و ڕوو سوورییەك دەکەن، ئەویش بەهۆی یادەوەری‌و یادگارییەکی زۆر گەورەو گران و بەنرخە کە یادی لە دایك بوونی پێغەمبەری پێشەوامان (محمد المصطفی ) ﷺ بەو هەموو مەعناو بەهرەو ئامارژە جوانانەی کە لە لەدایك بوونی پێغەمبەری ئازیزدایە ﷺ بۆیە بەڕاستی پێویستە مێشك و دڵ و گیانمان ئامادە بکەین و بیکەینەوەو بیسازێنین تاوەکو جێی ئەو یادە خۆشەی تێدا بێتەوە ، تاوەکو بۆن و بەرامەو بەهرەو بەرەکەتی ئەو کەسەو ئەو ڕیسالەو ئەو تەبیعەتە وەربگرێت، تاوەکو خۆی پێئامادە بکات و خۆی پێبڕازێنێتەوە ، خۆی پێجوان بکات، خۆی پێئارایش بدات وەخۆی پێتەیار بکات بۆ بەرەنگار بونەوەی جەهل و نەفامی و دواکەوتوویی و زوڵم و ستەم و هەموو چەمکە خراپ و چەپەڵەکان، تاوەکو بۆ بەرەنگاری ئەبو جەهلەکانی سەردەم و زەمانە خۆی بسازێنیٚ، تا بتوانێت دامەزراو و ڕاوەستاو بێت لەسەر ئەو شەقامە ڕێگەو لەسەر

ئەو ئامانج و ئەمانەت و خەڵاتەی کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لە بەینی دەستی ئێمەدا جێی هێشتووە، تاوەکو خۆمانی پێجوان بکەین و خەڵکانی تریشی پێ برازێنینەوە، تاوەکو بیگەیەنین بە خۆمان و ماڵ ومناڵ و دەورو بەرو قوتابی و شاگردمان وە بیگەیەنین بە میللەتان، تاوەکو بەو ئەمانەت و خەڵاتە نەبەوییە ئاسمانییە ببینە ﴿خيرُ أُمَةٍ أُخرِجَت للناس﴾ ..

خۆشەویستەکان: پێغەمبەری خۆشەویست و پێشەوامان (محمد المصطفى) ﷺ ڕۆحم بە قوربانی بێت، هەزاران درودو سەلامی خوای گەورەی بڕژێت بەسەردا، بەرامبەر بەو هەموو جیهادو جوهد و خەبات و شەو نخونی و تێکۆشان و فرمێسك و سجود و ڕکوعەی کە بردی بۆ خوای گەورە ئەو هەموو خەباتەی کە کردی بۆ مرۆڤایەتی...

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ کەسێکی ساناو سادەو عادی نییە، وا بەسادەیی تێی بگەین و هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکەین، پێغەمبەری خۆشەویستمان ئەوەیە کە خوای

گەورەو پێناسەی ئەکات و لەبارەیەوە ئەفەرموێت: ﴿إنَكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمْ﴾ ئەوەیە کە خوای گەورە باسی ئەکات ﴿وَما أرسَلناكَ إلا رَحمَةً للعالَمين﴾ ڕەحمەتی خوایە، خوا کە ڕەحمان و ڕەحیمە لە (بسم لله ) هەموو جارێ ئەیڵێینەوە.. ئەو ڕەحمەت و ئەو ڕەحمانیەتی خوا لە پێغەمبەردا ﷺ بەرجەستە بووەو لە پەیام و ڕیسالەکەی ئەودایە...

پێغەمبەری خوا ﷺ موجەسەمەی هەموو جوانی و هەموو پاکی و هەموو بەرزی و هەموو بڵندی و هەموو سۆزو هەموو خەڵات و هەموو خەبات و هەموو میهرەبانییە، هەموو شتە پیرۆزەکان لە کەسایەتی ئەو پێغەمبەرە نازدارەدا کۆ بونەتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ یەعنی موجەسەمەی ئادەم، إبراهیم، نوح، موسی ، عیسی ، و هەموو پێغەمبەران، وە هەموو خەباتیان و ڕیسالەیان و هەموو پەیامەکەیان، یەعنی سەفیری خوا، یەعنی ناطیقی ڕەسمی (الله)، نوێنەرو کوڕی دڵسۆزو برا گەورەی هەموو پێغەمبەران، یەعنی ئەمیری هەموو ئەمانەتەکانی ئاسمانە، هەرچی کەلیمەی وەحی لە

خواوە دابەزیبێت بۆ سەر زەوی و بۆ سەر مرۆڤایەتی، لە قورئانی (محمد)دا کۆبووەتەوەو بە پاکی حفظ کراوەو لە قورئانەکەی ئێمەدا هەڵگیراوە، سیرەت و سوننەت و خەبات و جیهادی سەرجەم ئەو پێغەمبەرانەیە کە لە قورئانی ئێمەدا تۆمار کراوەو پارێزراوە، ئەگەر بتەوێت پێغەمبەرێك بناسیت، ئەبێت نەگەڕێی لە تەورات و ئینجیل و تأریخ و لێرەو لەوێداو بزانی کێیەو چی کردووەو چی وتووەو چی بەجێهێشتووە، ئەبێ بچی لە قورئانی پیرۆزدا بگەڕێی بزانی (عیسی) کێیە، (موسی) کێیە، (ئادەم) کێیە، (حەوا) کێیە، (نوح)و (إبراهیم)و هەموو پێغەمبەرانی ترو صالحانی ئوممەت و خراپان هەموو مێژوویان لە قورئانەکەی محمد ﷺ دا تۆمار کراوە...

وە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە بۆ پارێزگاری و حیمایەی ئەو هەموو دەستکەوت و جیهادو پەیامەی کە ئەوان گەیاندوویانە، ئەگەر عیسی ی ڕاستەقینەت ئەوێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە ئەوە نییە کە مەسیحییەکان ئەڵێن کوڕی خوایە یان ئەڵێن (رَبُنا اليَسوع ) خوایە، یان سێیەکی خوایە،

(حاشا لله وكلاّ)، عیسى هەروەکو محمد پێغەمبەرێکەو بەندەیەکی خوایەو ڕۆڵەی عەبدی خوا بووە، ﴿كَانَا يأكُلانِ الطَّعامِ﴾ بە دەقی قورئانی پیرۆز، ئەگەر بتەوێت موسی بناسی ئەوە ئەو (موسی)یە نییە کە لە تەورات و تەلمودا درۆزنەکەی ئەوانا ئەڵێن: ئەگەر بتەوێت نوح و لوط و پێغەمبەرەکانی تر بناسی، ئەبێت بگەڕێیتەوە بۆ سەرچاوە ئەصڵییەکەی کە محمدەوﷺ ئەو قورئانەیە کە خوا بە محمدﷺ دا ناردوویەتی، کە ئەمانەتەو ئەمانەتێکی گرانبەهاو بەنرخە لە لای ئوممەتی محمد ﷺ کە هەڵی گرتووەو پاراستوویەتی، وە ئێمەی کردووە بە ئەمینی سەر ئەو خەزنەو ئەمانەتە، کەوابێ کە ئێمە ئەڵێین محمد ﷺ ، یەعنی هەموو خەڵات و هەموو وەحی، وە هەموو پێغەمبەران و هەموو پاکان و چاکانی ڕووی ئەم سەر زەمینە، وە هەموو ئەو کەسانەی کە لە دەرگای خوایان داوەو بە ئیخڵاصی قسەی لەگەڵ کردوون و قسەیان لەگەڵ خوا کردووەو سیرەتی ئەوانەی کە ڕکوع و سجودیان بۆ خوا بردووە ، کە

بتیان شکاندووە، کە مرۆڤایەتییان ڕزگار کردووە، کە ئافرەت و کۆیلەکانیان قوتار کردووە ..

پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مرۆڤایەتی یەعنی بیلبیلەی چاو، یەعنی فێنکایی دڵ، یەعنی بەهاری دڵان، یەعنی نووری چاوان، یەعنی شا دەماری ژیان، یەعنی هەموو شتێکی موقەدەس و پیرۆز، بەس عەجەبەن ئێمە ئاوا پێغەمبەر ئەناسین ﷺ و ئاوا موعامەلەی لەگەڵ ئەکەین و ئاوا دڵمان پێوەی بەندە، وە ئاوەها خۆشمان ئەوێت، وە ئاوەها بەگوێی ئەکەین، وە ئاوا ڕازی ئەکەین، وە ئاوا بیلبیلەی چاومانە، وە ئاوەها تاجی سەرمانە، وە ئاوا ڕابەرمانە لە سیاسەت و ئابووری و ماڵ و دەروونمانەوە، وە ئاوا بە گوێی ئەکەین ، وە شەرع و بەرنامەی ئەو شیعارو شعووری ئێمەیە یان بەرنامەی ترو شتی ترە، وە ئەو چاو ساغ و پێشەنگ و پێشەوامانە یان لە دوای خەڵکی کوێرو بێچاوەوە ئەڕۆین و هەنگاو ئەنێین، وە ئێمە فیعلەن بە گوێی ئەو ئەکەین و وەلی ئەمری ئێمە ئەوە، مەحبوب و مەعشووقی ئێمە ئەوە، یان خەڵکانی ترەو کەسانی ترە، بەداخەوە ڕووم نایە بیڵێم

ئەگینا کەسانێکی ترن، ئایا ئەو پێغەمبەرەمان ڕازی کردووە کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَقُّ أَن يَرضوهُ أن كانوا مؤمنين﴾ ﴿وَمَن يَطِعِ الرَسولَ فَقَد أطاعَ اللَّه﴾ ئایا بەگوێی ئەو پێغەمبەرە نازدارەمان کردووەو ئیتاعەمان کردووەو ڕازیمان کردووەو ئایا کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَما أرسَلنا مِنْ رَسولٍ إلا لِيُطاع بأذنِ لله﴾ . ئایا ئیتاعەی ئەو پێغەمبەرەمان کردووە، فیعلەن پێغەمبەر بوو، پێغەمبەر موطاعە لە ماڵدا لە خێزانا، لە بازاڕا، لە مزگەوتا، لە کۆڵانا، لە شەقاما، لە بواری پەروەردەمان دا، لە سیاسەتمان دا، لە جامیعەو لە خوێندنگاکان دا، لەناو سەقافەو فەرهەنگەکان دا، ئایا ئەو ئوستادو پێشەوامانە، ئایا ئەو ئیمامەمانە کە خوای گەورە کردوویەتی بە ئیمامی مورسەلین، کە نەك بە ئیمامی سادەو عادی ، کردوویەتی بە ئیمامی (نوح و إبراهیم و موسی و عیسی)و تەواوی پێغەمبەران.

لە ئیسراو میعراجا، یەکێ لە نهێنییەکانی ئیسراو میعراج ئەوەبوو کە ئەوان زیندوو کرانەوەو لە ئاسمانەوە هاتن بوون بە شاگردی پێغەمبەرو شایەت و ئیمانیان بە

شانی ئەو هێنا، چوونە سەر کیتاب و سوننەت و مەزهەبی پێغەمبەر ﷺ، وە کردیان بە پێشەواو نوێژیان لە دوای ئەوەوە کرد، ئەو کە ئیمامی موڕسەلین و خاتەمی نەبیین و سەیدی ئەولیاو صاڵحینە، چۆن پێشەوای ئێمە نییە، ئیتر مەعقولە ئیمامی ئەو پێغەمبەرە گەورانە بێت، کەچی تۆ نەیکەی بە ئیمام و چوساغ و پێشەواو بچی لە دوای شەل و شەلەل و شەکەتەوە بڕۆی، لە دوای کوێرو بێ نەواوە بڕۆی، لە دەرگای خەڵکی بێ نەواو شەل و کوێر بدەی..

پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئێمە یەعنی هەموو شتێك ﴿فتأريخنا من رَسولِ لله مَبدَئُهُ وَما عَداهُ فَلا عِزُ وَلا شان﴾ ووجودی ئێمە، مێژووی ئێمە، فەخرو شانازی و شکۆی ئێمە، هەمووی لە ﴿إقرَا بِسمِ رَبِكَ﴾ وە دەست پێئەکات، هەمووی لە (محمد المصطفى) وە دەست پێئەکات، هەمووی لە ئەشکەوتی حیراوە دەست پێئەکات، هەمووی لە هیجرەت و غاری (ثور)ەوە دەست پێئەکات، هەمووی لە ﴿ن .. وَالقَلَمِ وَما يَسطرون . ..﴾ وە دەست پێئەکات، هەمووی لە ﴿يس.. وَالقُرآنِ الحَكيمْ﴾ وە دەست پێئەکات، هەمووی لە ﴿محمد

رَسول اللە وَالذین آمَنوا﴾ وە دەست پێ ئەکات، ئێمە فەخرو شانازیمان لە حامورابیدا نییە، لە فیرعەون و لە هامان و قارون دا نییە، لە فەنینیقیدا نییە لە عونصوریەت و شۆڤینیدا نییە، لە عروبەو کردودەو تروکەدا نییە، بەڵکو شانازیمان لەوەیە کە ئێمە مأموم و شاگردو قوتابی کەسێکین کە خوای باڵادەست هەڵی بژاردووە بە چاوساغ و پێشەواو ڕابەر، گەورەیی مرۆڤ لەوەدایە لە دوای چاوساغ و ڕەئوف و ڕەحیمێکەوە بڕوا، خوا ناوی ناوە ﴿لَقَد جاءكُم رسولٌ مِن انفُسِكُمْ﴾ پێغەمبەرێکمان بۆ ناردوون لە خۆتان و جوزئێکە لە ئێوەو ئەو ئێشەی کە بە ئێوە ئەگات، لە پێشا بە دڵی ئەو ئەگات، ئەو ئێشانەی کە بە لاشەی ئێوە ئەگەن لە پێشا لاشەی ئەو ژان ئەکات، ﴿كَمثلِ الجَسَدِ الواحِدِ إذا إشتَكى عُضُوٌ تَداعى لَهُ سائِرُ الجَسَدِ بالسَهرِ وَالحُمى﴾

خۆی ئەفەرموێت: ﴿مِنْ انفُسِكُمْ﴾ غەریب نییە دۆستتانە، دڵسۆزتانە، چاو ساغتانە، پێشەواتانە، مامۆستاتانە، خێرو بەرەکەتە بۆ دونیاو بۆ ئاخیرەتتان، خۆی ئەفەرموێت: تا ماوم نەمهێشت گومڕابن، نەمهێشت

وەکو (بەنی ئیسرائیل) و میللەتانی تر سەرتان لێ بشێوێ و بگەڕێنەوە بۆ باوەشی لات و عوزا، بۆ خێمە شڕەکەی شیرك و ئەبو جەهل و وێنەکانی، کە مردیشم هەمو ڕۆژێکی دوو شەممەو پێنج شەممە کردەوەی ئوممەتەکەم دێننە بەرچاوم و ئەخرێنە بەردەستم و فریشتەکان بە ئەمری خوا ئەیهێنن، کە وەختێ چاکەکانتان ئەبینم خۆشیم بۆ دێ و دڵم خۆش ئەبێ و کەیفم پێی دێ و سەرم پێی بەرز ئەبێتەوە، کە وەختێ هەڵەکانیشتان ئەبینم چاو شۆڕ ئەکەم بەرامبەر بە بارەگای خوا، ئەڵێم یاڕەبی ئوممەتی ئوممەتی، لە ڕۆژی حەشرو سەختییەکان دا، لەو ڕۆژەدا کە هەموو دونیا هاوار ئەکات ، هەتا پێغەمبەرەکان تەنها خەمی خۆیان ئەخۆن، ﴿يَومَ يَفِرُ المَرءُ مِن أَخيهِ﴾ ﴿يومَ يُحْشَرُ المَرءُ﴾ هەمووی ڕائەکات، هەمووی هەڵدێت لە ژنی لە دۆستی، لە خۆشەویستی، لە ڕۆژی... ﴿الاخَلاءُ يَومَئِذٍ بَعضُهُمْ لِبَعضٍ عَدُوٌ إلا المُتَّقينْ﴾ هەمووی شیعاری نەفسی نەفسی یە ﴿الا لَهُ وذاتهُ﴾ گەورە کراوە بە تەنها ئەو هاوار ئەکات یاڕەبی ئوممەتی ، ئوممەتی، هەر ئەوە ئاگای لە ئوممەتەکەی هەیە،

هەر ئەوە شەفاعەتی ئوممەتەکەی ئەکات، لەو ڕۆژە سەختەدا ئازیزەکانم کە سەختترین ڕۆژە، کە سەختتترین سەعاتە مرۆڤ بە خۆیەوە بیبینێت، سەختترین قاعەی تاقیکردنەوەیە، لە ڕۆژێ کە مرۆڤی تێبچێت، ئا لەو کاتەدا ئوممەتی نوح ئەڵێن: خوا موحاسەبەیان ئەکات و ئەفەرموێت: لەوانە ئەپرسین کە پێغەمبەرن، لەوانەش ئەپرسین کە پێغەمبەرانیان بۆ نێردراوە، لە هەردوکیان ئەپرسین: ﴿فلَنَسئَلَنّ الذي أُرسِلَ إليهِمْ وَلَنَسألَنَّ المُرسَلين﴾ بەگوێرەی ئەو فەرمانە خواییە خوای گەورە موحاسەبەی قەومەکەیان ئەکات، بە قەومی (نوح) ئەفەرموێت: نوحم نارد (٩٥٠) نۆسەدو پەنجا ساڵ بانگی کردن و فێری کردن و لە بت پەرستی ڕزگاری کردن، ئەمرو فەرمانی منی پێگەیاندن، کەچی ئەو ئوممەتی نوحە، ئەو بێوەفایانە هەموو بەیەك جار ئەڵێن: نوحمان هەر نەبینیوە، نوحی چی، نوح هەر نەهاتووە بۆ لای ئێمە، نوح چی بکات یەعنی وا دائەمێنێت نازانێت چی بکات، پەنا ئەبات بۆ هەر کەسێك دادی نادات، ئەڵێ یاڕەبی من یەك شاهیدم هەیە ئەویش (محمد المصطفى) یە ﷺ کە پێشەوای

موتەقین و موڕسەلین و ئوممەتەكەیەتی، ئەو كاتە پێغەمبەرو ئوممەتەكەی بانگ ئەكەین ، ئێمە ئەچین ئەڵێین ئەرەوەڵا قوربان نۆسەدو پەنجا ساڵ ئەم پێغەمبەرە ئوممەتەكەی خۆی بانگ كردن بە شەو و بەڕۆژ و بە ئاشكراو بە نهێنی، یەكە یەكەو دانە دانەو گروپ گروپ و كۆمەڵ كۆمەڵ، ئەوجا خوای گەورە لێی خۆش ئەبێت، لەو موحاسەبەو لەو موحاكەمەیە نەجاتی ئەبێت، هەتتا پێغەمبەر نەك شەفاعەت بۆ ئێمە ئەكات، بەڵكو شەفاعەت بۆ پێغەمبەران و ئوممەتەكانی تریش ئەكات. ﴿بالمؤمنينَ رَؤُفُ الرَحيمْ﴾ نەك تەنها بۆ مسلمین،بەڵكو﴿بالمؤمنينَ رَؤُفُ الرَحيمْ﴾ فریای ئەوانیش ئەكەوێت ...

ئەوە پێغەمبەری من وتۆیە، ئەوە پێشەواو چاوساغی ئێمەیە، تۆ كە خوا خەڵاتێكی وەهای بۆ ناردووی قورئانێكی وەها، پێغەمبەرو ڕابەرێكی وەها، بە شاهیدی ئەبو جەهل ناوی (صادق الأمين ) دوژمنەكانی كە ڕاویان ناو دەریان كرد ، خۆیان وتیان (محمد)ﷺ ڕاستگۆو دەستپاك و دەمپاك و داوێن پاك و نیاز پاكە، دوژمن پێت بڵێت (صادق الأمين )

ئیسپاتیان کرد، کە کاتێ کەعبەیان کردەوە ، بەردە ڕەشەکەیان بەو دانا، ووتیان کەس شیاوی ئەوە نییە ئەو حەکەمی و ئەو کارە پیرۆزە بکات ئەو نەبێت، خۆ ئەمانە موسوڵمان نەبوون وایان ووت، کافرەکان بوون، کاتێك کافرەکان ڕاویان نا، پێغەمبەری خوا ﷺ شتی عالەمی لا بوو، ئەمانەت و شتی گرانبەها وەکو زێڕو زیو و شتە گرانبەهاکان کە کەس نەبوو لای دابنێن هەمووی لای پێغەمبەر بوو ﷺ، کە پێغەمبەریان ﷺ دەرکرد لە شارە پیرۆزەکەی خۆی کە مەککەیە، لە شاری منالی و گڕوگاڵی و دەعوەو جیهادو سجود و ڕکوع و خەباتی خۆی، یەکێك لە کارە گەورەکانی ئەوە بوو کە عەلی کوڕی ئەبو طالیب ی بانگ کردو ووتی: ئەو ئەمانەت و سپاردانە لای تۆ دائەنێم ، ووتی: ئەوە هی فلانە، ئەوە هی فیسارە، کە من ڕۆیشتم بیدەرەوە بە خاوەنەکانیان ، یەعنی سەیر بکە ئەو پێغەمبەرە دەری ئەکەن هەرچی شتە گرانەکانیشیان هەبوو لە لای ئەو دایان نابوو، کەسێك نەبوو لە شاری مەککەو لەناو قوڕەیش دا بەقەدەر محمد دەست پاك و دڵپاك و نیاز پاك بێت، دوژمن

ڕۆحی خۆی پێ ئەسپێرێ و ئەمانەتی لا دائەنێت، ئایا ئێمە کە جێنشینی پێغەمبەرین، ئاواین ؟، ئەوەندە ئەمینین لەسەر ئێوەو لەسەر دینتان، لەسەر منالّ و لەسەر ئیمانەکەتان، وە ئایا ئێمە ئەوەندە ئەمینین بەرامبەر ئەو پێغەمبەرە گەورەیە ﷺ ، ئاوا ڕێزی ئەگرین و ئاوا ئەیناسین و ئاوا شارەزاین، ئێمە کە مەولوود ئەکەین برێکمان هەروا بە دوو دەنگ چکلێت و بە پەرداخێك شەربەت و بە دەف لێدان و هەندێك شیعری لنگاوقوچ کراو و زۆربەی ناقۆڵاو پڕ لە بیدعەو شیرك، وا ئەزانین ئیتر یادی پێغەمبەرﷺ وا ئەکرێت، هەندێکی تریشمان پێمان قورسە صەڵاوات لە دیداری بداو پێی زۆرە بڵێ: گیانم بە قوربانت بێت، دایك و باوکم بە قوربانت بێت، هەندێکی تر لەولاوە ڕۆژانێ نییە هەر یادی هیجرەت و بەیعەت و مەولوود ئەڕوات، بەقەدەر یەك لەحزەو میلادی مەسیح و مەسیحییەکان گرنگی بە پێغەمبەرو مەولودەکەی نادەن، گرنگی بە قورئانەکەی و بە دینەکەی و بە ئوممەتەکەی نادەن، ساڵی هیجری هەر نانوسرێ لە موڕاسەلاتی ئەم حکومەت و میللەتەی خۆمان دا، ئەبەدەن

ساڵی هیجری نانوسرێت، ئێستا ئێمە نازانین چ ڕۆژ و چ مانگ و چ ساڵێکی هیجرییە، موسوڵمانەکانیش لە بیریان چووەتەوە، هەر ساڵی میلادی ئەزانن، ساڵی میلادی هی ڕۆمەکان و هی پێش ئیسلامە، با بزانین موسوڵمانەکان ئێمە لە هیجرەتەوە بووین بە پیاو، مێژووی ئێمە مێژووی هیجرییە، کۆچی ئەو نازدارەیە، ئەوەتا ئەوەندە بێوەفاین، مێژووی هیجرەتی پێغەمبەرەکەشمان نانوسین، یان یادی لە دایك بوونەکەی هەر بە سادەیی ئەکەینەوە ، بەشێوەیەکی وەها ڕەق و وشك بەناوی سەلەفیەت و ئەم شتانەوە، وەکو ئەوەی ئیتر ئەو پێغەمبەرە ﷺ بەردێکەو دارێکە لەویا کەوتووەو وەکو هەر مردوو بەشەرێکی تر وایە، هەر هەمووی بێمانابیەو جۆرێکە لە بێوەفایی ، فەرموو ئەوە یادی مەولوود دێ هەموو ساڵێ ئەوە یادی هیجرەت و بەیعەت و ئەنواع یادی ئەم پێغەمبەرە نازدارە دێت ﷺ بزانە بەقەدەر ڕوبعێکی سەری ساڵی مەسیحی گرنگی پێ ئەدەین، تەماشای کەناڵە ئاسمانییەکانتان بکەن بزانن خواو پێغەمبەرو مزگەوت و دین و ئەو شتە پیرۆزانە، هیچی هەیە

لەو کەناڵانە، تەماشای ڕۆژنامەو صەحافەو کۆڕو کۆمەڵ و سیمینارو سیاسەت و کاربەدەست و مەسئولت بکە کە هەمووی نانی ئەو پێغەمبەرە ئەخۆن، هەمووی نانی ئەو ئیسلامە ئەخۆن، هەمووی بەچکەی حوجرەو شێخ و تەکیەن، ئەوەندە بێوەفان، جا ئەوە وەفایە، ئایا ئێمە ڕاست ئەکەین لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ پێغەمبەر ئەناسین ڕێزمان لێگرتووە، ناسیومانە ڕەحمەتمان لێ وەرگرتووە، کە ڕەحمەتە بۆ هەموو جیهان و بونەوەر.

کە پێغەمبەر هات ﷺ هەموو ژیان و ژینگەو دونیای مرۆڤی گۆڕی، بەڵام ئاماژە ئەکەم بۆ خزمەتێك کە کردوویەتی بە مرۆڤایەتی کە شای هەموو خزمەتەکانە، هەر لەو خزمەتە، هەر ئەوەی بەسە بۆ ئەوەی تاجی سەرو بیلبیلەی چاوان و نووری دڵان بێت، وەفامان بەرامبەری هەبێت، ئیمامی ئەوەل و ئاخیری ئێمە ئەو بێت، ئەویش ڕزگار کردنی ئەم مرۆڤایەتییەیە لە بت پەرستی، لە کۆیلایەتی، لە کوشتن و بڕین و زیندە بەچاڵ کردنی ئافرەت، ڕزگاری کردین لە چینایەتی لە ڕەگەز پەرستی، لە

شۆڤێنیەتی، لە جیاوازی دەوڵەمەندی و هەژاری، ڕزگاری کردین لەوەی کە نرخی مرۆڤ لە وورگیا نییە، لە گریفانیا نییە، لە مەعیدەیا نییە، لە ڕەنگیا نییە، لە زمان و لە زاریا نییە، ئەوانەی هەموو سڕییەوە، فەرمووی: ﴿كُلُكُمْ مِنْ آدَمَ وآدَمُ مِن تُرابْ﴾ فەرمووی: ﴿لا فَضل لعربيُ على عَجَميُ إلا بالتَقوى﴾ ... ﴿إنَ اكْرَمَكُمْ عِندَاللهِ اتقاكُمْ﴾ پێست سپی ڕێزی نییە بەسەر پێست ڕەشا، ئیللا بە تەقوای خوا نەبێت... ﴿يا أيُها الناسُ إنا خَلَقناكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وأُنثى وَجَعَلناكُمْ شعوباً وَقَبائِلَ لِتَعارِفوا﴾ نەك ﴿لِتدابَروا، وتقاطَعوا وَتَقاتَلوا ...﴾ ﴿إنَ اكرَمَكُم عِندَاللهِ اتقاكُمْ﴾ ئەو قورئانەو ئەو خەڵاتەی هێنا ، ئەمە دیارییە ، ئەمە دینە، ئەمە پرۆگرامە، ئەو قورئانەی بۆ هات... ﴿وَلَقَدْ كَرمنا بَنی آدم﴾ نابێ کۆیلە بێت، نابێت سوکایەتی پێبکرێت، نابێت مافی بخورێت، نابێ برسی بکرێت، نابێت ڕابگوێزرێت، نابێ دەربکرێت، نابێ کەم بکرێتەوە، نابێ ببێتە دەرەجە دوو سێ و چوار، نابێ بە گوێرەی ڕەنگەکەی و زمانەکەی کە خەتای خۆی تیا نییە، خەتای ئەو کەسە چییە کە پێستەکەی ڕەشە، ئەی فەخرو

شانازی ئەو کەسە چییە کە پێستەکەی سپییە یان سورە، ئەو گوناهی چییە کە لە فلان بستە زەوی لەدایك بووە، ئەوی تر ئازایی چییە کە لە ئەوروپا لەدایك بووە، ئەوانە بیٚ ویژدانین، ئێستاش ئەو خەڵکە ئەو جاهیلیەتی قەڕنی بیست و یەکەمە، تازە ئەمانگێڕێتەوە، ئەوە ئەوروپییە عالەمی دووەمەو ئەوە ئەمریکییە جیهانی یەکەمەو ئەوە ئاسیاو ئەفریقاییەو جیهانی سێهەمە، تازە خەڵك دابەش ئەکات بە گوێرەی ڕیخۆڵەو مەعیدەو چەندە گیرفانی پڕ بیٚ ئەوە یەکەمەو ئەوە دووەمە، ئەوەش هیچی تیا نەبێت ئەوە سێهەمە، تازە لەسەر بناغەی وورگ و مەعیدە، لەسەر بناغەی مادیەت و حەیوانییەت مرۆڤت بۆ دابەش ئەکات، بۆ جیهانی یەکەم و دووەم، تازە باسی نیهایەتی تأریخ و شارستانیەتو شەڕە دەنوك و چینایەتی و شۆڤینیەت و عونصوریەت و ڕەگەز پەرستیمان بۆئەکەن بە خەڵات، تازە ئەو مردارەوە بووەمان دەرخوارد ئەدات، کە پێغەمبەرهات ﷺ فەرمووی: قەومایەتی و عونصوریەت و شۆڤینیەت واز لێبێنن ، ئەوە گۆشتە ڕزیوو ئێسکە ڕزیوە، مەیخۆن

مەعیدەتان فاسید ئەکات، دەمارو خوێنتان بۆگەن ئەکات ، توشی سەرەتان و ئافاتتان ئەکات، تازە ئەورووپا دێ دەرخواردی ئێمەی ئەدات، بە نرخی تازەو بە ناوی مۆدێرن و نوێ خوازی و حەداثەو ئەو شتە پڕو پوچ و درۆو دەلەسانە، وە تازە ئێمە بەو شتانە ئەخەڵەتێنن، تو خوا وەرە تۆ پێشەوایەکت هەبێت، پێغەمبەر بێت ﷺ، ﴿رَؤوفُ رَحيمْ﴾ بێت، ﴿رَحمَةَ للعالَمينْ﴾ بێت، هەڵگری پەیامی سەرجەم پێغەمبەران بێت، ڕۆڵەی صالح و موصلیح و برا گەورەی هەمووان بێت، هەموو کەس خێرو بێری ئەگەڕێتەوە بۆ نورو ناوچاوی ئەو، جیهادو خەباتی صەحابەو ئەهل و بەیتەکەی، کەچی بێیت دوای بەراز خۆرو عەرەق خۆرو شەروالْ پیس و ئایدزاوی بکەوی، ئەوانە بە پێشەوای خۆت بزانی، لە دەرگای ئەوانە بدەی، بە دوای ئەوانا غار بدەی، داوای خێرو نوورو فەڕ لەوانە بکەی، کە خۆی بێ خێرو بێ نوورو بێ فەڕە، کە خۆی دەرۆزەکەرو موفلیسە، کە خۆی لەگەڵ سەگ و پشیلەو مەیمون دا ئەژی، کە خۆی حەڵاڵ هەر نازانێت، کە شذوذی جنس لە کەنیسەکەیا ئەکرێ، تۆ داوا لەوە بکەی،

تۆ بە هیوای ئەوە بیت و ئەوە فریات بکەوێت و ئەوە وولأت و مەنهەج و پڕۆگرام و فێری مرۆڤایەتیت بکات، ئەو پێغەمبەرە گەورەیە واز لێبێنی خۆت سەرقالْ بکەی بە حامورابی و بە فەینیقی و فیرعەون و بە حەزارەتی ڕزیوو کۆن و بەم شتە پڕو پوچانە بمانگێڕنەوە بۆ زەردەشتی و مەجوسی و ئاگرپەرستی جارێکی تر بگەڕێینەوە بۆ پت و خاك و ئەستێرە پەرستی.

پێغەمبەر ﷺ گەورەترین خەڵاتی ئەوەبوو توانی مرۆڤ ڕزگار بکات لە شەهوەت، لە کۆیلایەتی، لە بت پەرستی، لە زەعامەت پەرستی، لە (بالروح بالدم) و ئەم شتە بیْ مانایانە، گەورەترین بتەکانی هەموو شکاند، لە ویژدانا شکاندی ، لە دەرونا شکاندی، لە دڵا شکاندی، وایلێکرد کەس ڕازی نەبوو بە کۆیلایەتی ....

کۆیلەیەك هەبوو ناوی (وەحشی ) بوو، ئەوەندە بێزار بوو لە کۆیلایەتی، لەبەر ئەوە کە دەنگی پێغەمبەری ﷺ گویْ لێبوو، کە ﴿اللهُ اکبر﴾ ی بیلالی گویْ لێبوو، زانی بووی بیلال بە ﴿لا إلهَ إلا الله﴾ ڕزگاری بووە، خۆی پیْ نەگیرا

ووتی: ئەبێت خۆم ڕزگار بکەم، چونکە کۆیلایەتی چینایەتی قێزەون بوو بە هاتنی پێغەمبەر ﷺ هەموو خەڵك حەزی لە ئازادی کرد، دەرزی ئازادی لە هەموو کەس دا، بۆنی ئازادی کرد بە لووتی هەموو کەسێك دا، ئەوەشی کۆیلە بوو ڕازی نەبوو، چۆن ڕزگاری ببێت باشە ، ووتی هەمو شتێك ئەکەم بەس لە کۆیلایەتی و عەیب وعار ڕزگارم ببێت، بێمە ڕیزی ئادەمیەت (وکرمّنابنی أدم)ەوە، ژنی ئەبو سوفیان ووتی: وەرە حەمزەم بۆ بکوژە کە مامی پێغەمبەرە، شەرت بێ ڕزگارت بکەم، ئەو تاوانە گەورەیەی کرد لە پێناوی ڕزگاریدا، ئەوە کەمە حەمزە بکوژێ، (سید الشهداء ) ئەو پیاوە گەورەیە، ئەو ناصری ئیسلام و پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئەو تاوانە گەورەیەی کرد لە پێناوی چییا ؟ لە پێناوی ڕزگار بوون لە کۆیلایەتی، کێ فێری کرد ؟ کابرایەکی تر لە میصر، لە مەدینە شکاتی ئەکرد لەوەی کە زللەیەکی لێ دراوە لە وەرزش یاری مارادۆنادا، کێ ئەو دەرزییەی لێدا کە ئەو کۆیلایەتی و چینایەتییە هەڵەیە، لە میصرەوە بێی بۆ لای (عمری کوڕی خطاب ) بۆ مەدینە بۆ یەك زللە، قەبوڵ

نەکەی شەق وزللەیەکت لێبدرێت، کێ بانگی ئازادی دا بە گوێی مرۆڤایەتیدا، وە کێش جارێکی تر ئەمانگێڕێتەوە بۆ کۆیلایەتی، بەڕاستی غەرب و دارودەستەکانی و عەلمانیەت ئەیانەوێ جارێکی تر بمانگێڕنەوە بۆ شتی بێماناو کە کەس قەبووڵی کەس نەکاو کەس ئەوی تر نەخوێنێتەوە، هەتا قەومێ لە خێزانێك دا ئەوی تر قەبوڵی خوشك و برا تەحەمووڵی یەکتری نەکەن و ژن ومێرد یەکتری نەخوێننەوە، ئەو پەڕۆیەك هەڵگرێ، ئەوی تر پەڕۆیەکی تری قەبوڵ بێت، ئەو ڕەنگێ ئەو ڕەنگێکی تر، نازانم کەی ئێمە دەرس وەر ئەگرین، مرۆڤ کە لە دوای پێغەمبەرەوە نەڕۆی، هەموو شتێکی لێ ئاوەژو ئەبێت، هەموو شتێك بە لنگاو قوچی ئەخوێنێتەوە، هەموو شتێ بە نەزانانە پیادە ئەکات، سلیمان کە وەختێ خوای گەورە پێی بەخشی، سەری دانەواندو فەرمووی: ﴿هذا مِنْ فَضلُ رَبي . لِيَبلوئى أم اشكُرْ ام اكفُرْ﴾.

پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە مەککەی ڕزگار کرد هەموو دونیا ملکەچی بوو کەوتە بەرپێی، جاڕی عەفووی دەرکردو فەرمووی: ﴿مَنْ دَخَلَ دارُ ابو سوفيان فَهُوَ آمن﴾ کە دوژمنی

پێغەمبەر بووﷺ ئەوجا ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ﴾ ی بۆ هات و سەری دانەواندو گریا، ئیستغفاری كرد بە ئەمری خوا، فەرمووی: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ۝ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا﴾ لەكاتی فەتح دا سەری بۆ خوای گەورە دانەواندو گریا، خەڵك ئاوا پێشوازی نیعمەتی خوا ئەكات، ئێمە نیعمەت بە شەڕە پەڕۆو بە عەرەق خۆری و بە ڕەگەز پەرستی و بە دەعیەی بێماناو كوفرو ئیلحادی ناو تەلەفزیۆن و كەناڵەكان وڕۆژنامەو گۆڤارەكان، ئەوانە نیعمەتت نەك بەردەوام ئەیانكەین بە نیقمەت، ئەیكەین بە نەگبەت و نەهامەت، كەی ئێمە ژیر ئەبین، كەی چاو ئەخشێنەنەوە بە خۆمان دا، كەی وەك و كافرێ ئەژین، بابە گەردنیان ئازاد بێت، وەك و كۆریەك و یابانییەك بژی، ئێستاش ئەگەر بمانەوێ مەشروعێك بكەین، ئەبێت بچین یان كۆرییەك یان یابانییەك بێنین، پیاوەكانی خۆمان هەموو تەزویرو غەش ئەكەن، هەموو چیمەنتۆكەش تێكەڵ ئەكەن و وای لێئەكەن كە بینیمان،ئێستاش ئەمانەوێ پردێك دروست بكەین ئەبێت

بچین ئەوان بهێنین بۆمان دروست بکەن، بۆ ئەبێ ئاوا دەستەپاچە بین، بۆ ئەبێ (یَدُ السفلی) بین و(ید العلیا نەبین)، بۆ لە جیاتی موخەدیرو ڕەقص وسەما و عەرەق خۆری ئەو گەنجە فێر ناکەین، بۆ نازی ناکێشین، لە جیاتی ئەوەی کە لەم وولاتە هەڵبێت، با تەعینی بکەین و دەست بهێنین بە سەریداو وولاتی خۆمانەو ئەو نیعمەتە خوا داویەتی با بەیەکەوە بیخۆین و ئیتر چاو سوور نەکەینەو لە یەك و شەڕە پەڕۆ نەکەین و خەڵك بێ نازو تۆراو نەکەین و ئەو گەنجە لە جیاتی ئەوەی جادە بپێوێ، با جادەی پێ دروست بکەین، لە جیاتی ئەوەی دزۆی نیسان بکات، با سەیارەی نیسانی پێ دروست بکەین، لە جیاتی ئەوەی سەرسەری بکات بە دەوری قوتابخانەو جامیعەکانا خەریکی خۆ نواندن و میکیاژ بێت، با فێری بکەین چۆن وولاتی کاول بوو ئاوەدان ئەکاتەوە، با بیناسێنین کە پێغەمبەری هەیەو پێشەوای هەیەو خواو قورئانی هەیە، میللەت و شارستانی هەیە، با خۆی سوك و ڕیسوا نەکات، نەبێتە لاقرتێ و گاڵتەجاڕی میللەت و مێژوو.

## ﴿ووتاری هەڵبژاردنی هاوڕێ﴾

بِسْمِ اللهِ الحَمدُ للهِ رَبِ العالَمينْ وَالصَلاةُ وَ السَلامُ على سَيدِ الخَلقِ أجمَعينْ إمامنا وَمُقْتَدانا محمَدِ وَعلى آلهِ وَصَحْبِه وَمَن دَعى بِدَعوَتِه أجمَعينْ .. أما بَعدُ السَلامُ عَلَيكُمْ وَرَحمَةُ اللهِ وَ بَرَكاتُهُ ...

**موسوڵمانە بەڕێزەکان میوانە خۆشەویستەکانی سفرەی (أرحم الراحمين) سەلام و ڕەحمەتی خوا لە هەمووومان بێت ، وە ئەم کاتەو هەموو کاتێکتان پڕ لە خۆشی و شادی و ئیمان و تەقواو عاقیبەت خێری و دامەزراوی بێت.**

**ئەم دەرسەشمان دەست پێ ئەکات لە ڕەوشتی بەرزی موسوڵمان کە ئەویش(هەڵبژاردنی هاوڕێیە) با بزانین شەرعەن ئەبێ مرۆڤ هاوڕێیەتی کێ بکات، لەگەڵ کێدا بێت، کێ بکات بە هاوڕێی ڕێگای، وە لە کێش دوور بێت، لەو بارەیەوە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەرنامەیەکی تێرو تەسەلی داناوە، تاوەکو مرۆڤ هەم لە دونیادا بەختەوەر بێت هەم لە ئاخیرەت دا سەرورەرو سەردار بێت..**

**خۆشەویستەکانم: بەڕاستی مرۆڤ بونەوەرێکی کۆمەڵایەتییەو بە تەنها ناژی، بەڵکو لەگەڵ خەڵکان و**

دەوروبەرو ژینگەی خۆیدا ئەژی، لەبەر ئەوە هەرکەسێك بۆخۆی کاریگەری ئیجابی و سەلبی ئەبێت لەسەر خەڵکانی تر، وە خەڵکانی تریش کاریگەریان هەیە بەخێرو بەشەڕ لەسەر ئەم مرۆڤە.

کەوابێ مرۆڤ بونەوەرێکی (متأثر و مؤثر ) ە، بە حوکمی ئەوەی کەوا کۆمەڵ زیاتر کاریگەرە لەسەر تاك، بەڵام تاکیش جێ دەستی خۆی دیاری ئەکات لەسەر کۆمەڵ و لەسەر دەزگاکان و لەسەر کەلەبەرەکانی کۆمەڵگا، لەبەر ئەوە هەموو مرۆڤێك ئەگەر بیەوێت لە خۆشیا بێت و لە چارەڕەشیا نەبێت و داهاتووی پرشنگدارو ڕووناك بێت، وە لە لای خوا سەروەرو سەردار بێت، ئەبێت خەمی ئەم بوارە بخوا، وە زۆر بە جدیش خەمی بخوات، یەعنی مەسەلەکە مەسەلەی گاڵتە پێکراو نییە، کەوا بەجێی بهێڵین بۆ ئیختیارو هەڵبژاردنی مرۆڤ خۆی، یان بۆ زەوق و مەزاجی مرۆڤ خۆی، نەخێر ئەمە شەرع قسەی تیا هەیە و بەرنامە ڕێژییەکی تێرو تەسەل و تەواوی بۆ کردووە و لەیەکی جیا کردونەتەوە...

خۆشەویستان: لەم ژیان و ژینگەیەدا كە هەموومان تیایدا ئەژین، ئۆقرەمان گرتووە، دوو جۆر نقلّیات هەیەو دوو جۆر گەراج هەیە:

١. گەراجى وا هەیە خەڵكەكەى و سەیارەكانى هاوار ئەكەن یــاالله ، بۆ بەهەشت بۆ بەهەشت

٢. گەراجى وایش هەیە سەیارەو خەڵكەكانى و مرۆڤەكانى هەمووى جاڕ ئەدەن و هاوار ئەكەن كێ دێت بۆ جەهەننەم؟ با بچین بۆ جەهەننەم.

هەروەها هى وا هەیە لەم ژیان و ژینگەیەدا ئاڵاى شەڕى هەڵكردووە، كەسى واش هەیە خێمەى خێرى هەڵكردووەو ڕازاندویەتییەوە، هەیە ئاوا بانگ ئەكاو جاڕ ئەدات بۆ (معروف)، هەیشە جاڕ ئەدات بۆ بەتاڵ، وە هەروەها لەم جۆرە چەمك و شتە گرنگانە هەمووى هەیە، هەر لە بستە زەوییەكدا تۆ ئەتوانى نموونەى هەردوكیان ببینى، وە جیاشیان بكەیتەوە لەیەك، هەموو كەسێكیش لافیتەى خۆى هەڵواسیوە، دروشمێكى گەورەى لەسەر دەرگاكەى هەڵواسیوە...

بۆ نموونە هەیە ئەوەی هەڵواسیوە، هەیشە ئەڵێت: ﴿ألَيسَ فِي جَهَنَّمَ مَثوَ المُتَكَبِرِينْ﴾ ..﴿وَسيقَ الذينَ كَفَروا إلى جَهَنَّمَ زُمَرا وَسيقَ الذينَ أتَقوا إلى الجَنَةِ زُمَرا﴾ ..

هەروەكو لە قیامەتاو لە جاڕنامەی ئەوێدا هەیە، لەم سەر زەویەش دا هەیە، وە هەركەسێك تۆزێ ژیری خۆی بەكار بهێنێ و خۆی لە گێلی نەداو خۆی نەخەڵەتێنێ و خەڵكیش چەواشە نەكات، ئەمە زۆر بە ئاسانی جیا ئەكاتەوە، واتە ڕەنج و ماندوو بونێكی زۆری ناوێت، وە پێویست ناكات مرۆڤ شارەزاو پسپۆڕو پڕۆفسیۆر بێت تاوەكو ئەم دوو گروپە لەیەك جیا بكاتەوە، تاوەكو ئەم دوو گەراجە، ئەم دوو ڕێگەیە ، ئەم دوو خێمەیە، ئەم دوو پڕۆگرامە، ئەم دوو ئاڵایە، ئەم دوو بەرنامەیە، لەیەك جیا بكاتەوە، زۆر سەهل و ئاسانن ڕێك ئەكەوێت لەماڵێك دا فیرعەونێك هەیە لە پاڵیشیدا ئاسیایەك هەیە كە ژنەكەیەتی، هەر ڕێك ئەكەوێت لە ماڵێك دا پێغەمبەرێكی (ئولوالعزم) كە حەزرەتی نوحە وە ژنێكی كافری بێ ویژدانی هەیە، هەروەها لوط ی پێغەمبەری

خاوەن ڕەوشتی بەرزو داوێن پاك و دەعوەی داوێن پاکی، ژنێکی ناپاك و ناچاکیش لە بن دەستیا هەیە هەر لە ژێر لێفەو بەتانیەکەیدا، یان باوك و کوڕێك وەکو نوح و کوڕە لارەکەی، یان کوڕو باوکێك وەکو إبراهیم و ئازەرە بت تاش و بت پەرستەکەی باوکی ، ئەوەتا خوای گەورە لە سوڕەتێك دا کە سورەتی (غافر)ە باسی هەردوکیان ئەکات: ﴿یا قَومِ مالِ أدعوکمْ إلی النَجاتِ وَ تدعوننی إلی النارْ﴾ .

واتە: لەم دونیایەدا دۆعاتی (إلی النار) هەن وە دۆعاتی (إلی النور) هەن، بانگخوازی بەهەشت هەن وە بانگخوازی جەهەننەم هەن، لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە زۆر باسی تریشی کردوون:

﴿وَجَعَلناهُمْ ائمةً لِیَهدونَ بِأمرِنا لَما صَبَروا وَکانوا بِآیاتِنا یوقِنونْ﴾ . هەندێکی تریش ﴿وَجَعَلناهُمْ ائِمةً یَهدونَ إلی النارْ﴾ . خەڵکان بانگ ئەکەن بۆ جەهەننەم، جا ئەمە ڕێك ئەکەوێ لە گروپێکی بچووك دا لە خێزان گەورەتر، وەکو کۆڵان و شەقام و گەڕەکێك یان شارێکی گەورە یان شارێکی

بچووك، یان وولأتێك یان ئیمپراتۆریەتێك، ئەمە هەیە بە شكلْ وشێوازی جۆراو جۆر، بەلّام هەمووی مەفهوومە وە هەمووی مرۆڤ بە سادەیی لێی تێئەگات، بەس ﴿یا حَسرَةً علی العِبادْ﴾ مرۆڤ وەختی وا هەیە خۆی گێل ئەكات و خۆیشی و خەلّكیش چەواشە ئەكات، بەداخەوە ئیلهام و صیاغەی زەوق و حەزو خواست و ویژدانی مرۆڤەكانە، ئەمڕۆ ڕاگەیاندن ئەتوانیْ سپی بكات بە ڕەش و ڕەش بكات بە سپی، شیرینت لێبكات بە تالْ و تالْت لێبكات بە شیرین، پیاو چاكت لێئەكات بە خراپ و خراپت لێئەكات بە پیاوچاك، موجریمت لێئەكات بە پیاوی ئاشتی و ئیرهابیت لێئەكات بە پیاوی ئاشتی،و پیاوی صالْح و موسولْمان و بانگخوازی ئاشتی و چاكەت لێئەكات بە ئیرهابی و تیرۆریست و لادەرو پیاو خراپ، ئێمە ڕۆژانە هەموو ئەمانە ئەبینین، ئەوەندەش ئەیلْێین، یەكیْ خوا ڕەحمی پێئەكات سەری لیْ تێك ئەچیْ و ئیفلاس ئەبیْ و لە خشتە ئەبریْ، وەكو خۆیان ئەلْێن: ﴿الغایةُ تبرّرنا الوسیلة﴾ ﴿إكذب إكذب حتی یُصَدَّقَكَ الناسْ﴾ . فیعلەن ئێستە خەلّكی ئەوەندەیان

وتووە ئیسلام خراپە، ئیسلامی خراپە، کابرای حاجی و سۆفی و دەروێش و (راکع) و (ساجد) لێێ بووە بەڕاست، خەڵکی چەتەو جەردەشی لێبووە بە پیاو چاك ، ئەمە ڕاستییەکەیە، یەعنی بۆ نموونە دوور نەچین، جا خۆشەویستان پێویستە هەموو کەسێك چوارچێوەیەك بۆ خۆی دابنێت و خۆی خەمی خۆی بخوات و دوای کلاوی بابردو نەکەوێت، بە دەهۆڵ وزوڕنای کەسیش هەڵنەپەڕێت، وە ئاوازی خۆی بناسێت، هەموو کەسێك ئاوازی خۆی بناسێت.﴿یا قَومَنا أجیبوا داعِيَ اللهِ﴾ ﴿وَمَنْ لا یَجِبْ داعِيَ الله فَلَیسَ بِمُعجِزٍ فِي الأرضْ﴾ تەواو ئەبێت هەرکەس ئاوازی خۆی ، ئەگەر جەنابتان تێبینی بکەن کە ئەڵێم هەرکەسێك ئاوازی خۆی بناسێت، ئەگەر نەیناسیێ با بزانێت لە لیسی گێلانەو زۆریش گێلە، جا با شەهادەی دکتۆراو ماستەرو شان و شەوکەت و جل وبەرگ و گیرفانیشی پڕ بێ لە دۆلارو یۆرۆو ئەمانە، هەرگێلەو زۆریش گێلە، تێبینی بفەرموون هەر باڵندەیەك هەر ئاژەڵێك هەر گیانداریکی ئەم دونیایە کە خوا دروستی کردووە، فیکەیەك، جیکەیەك، نوکەیەکی هەیەو

بەوە بێچووەكانی كۆئەكاتەوە، بەوە گروپەكانی خۆی كۆ ئەكاتەوەو ئەیانترسێنیّ لە خەتەرو تیاچوون و وە كاتێكیش خەتەرەكە نەما، بەیەك لەحن كۆیان ئەكاتەوەو بە صەفارەی ئاگاداركردنەوە، وەكو كەو و چۆلەكەو ئەو ئاژەڵانەی بەو شاخ و داخەوەن، هەموو گیاندارێك، ڕێك ئەكەوێت ئەو درەخت و ڕووەكانەش وابن، ڕێك ئەكەوێت هەموو شتێك مۆسیقای تایبەتی خۆی هەیە، بەو دەنگانە یەكتری ئەدۆزنەوەو بە دەوری یەكدا كۆئەبنەوە، وەكو ئەوترێت:﴿الجنسُ مَعَ الجنسِ جَميلٌ﴾ .

بەڵام عەجیب ئەوەیە كە مرۆڤ بە فیكەی شەیتان هەڵئەخەڵەتێت، بە دەنگی زوڵاڵ و پڕ لە حەنینی پێغەمبەران نازانێت، ﴿مالِ ادعوكمْ الى النَجاةْ﴾ بلّیّ ﴿وَالله ما اريدُ النَجاةَ﴾ . ئەوجا ئەوی ﴿ادعوهم الى النار﴾، كەچی وەڵامی ئەداتەوە. ﴿رَبَنا إنَكَ من تُدخِلَ النار فَقَدْ اُخديتُهُ﴾ . دوای شەڕو عارو نار بكەویّ، كەچی دوای نورعلی نور نەكەوێت.

﴿وَمَنْ لَمْ يَجعَلْ لله لَهُ نوراً فَما لَهُ مَنْ نورْ﴾ بەڕاستی ئەبێت

هەمیشه بڵێین: ﴿اللهمَ نوّرْ قلوبنا﴾ ئەبێ بڵێین خوایه ڕوناكیمان پێ ببەخشه.

هەموو كەس دوو چاوی هەیه، بەس شەرته هەموو كەس بەصیرەت و دڵی بینەری هەبێ و دڵی مودریكی هەبێت...

خۆشەویستان: له ڕاستیدا باسەكه زۆر گەورەو گرانه، پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ قاعیدەیەكی جوانی داناوە و ئەفەرموێت: ﴿المَرءُ علی دینِ خَلیلِه﴾ . له فەرموودەیەكی تردا ئەفەرموێت: تۆ پێم بڵێ ڕەفاقەتی كێ ئەكەیت، من پێت ئەڵێم تۆ چ پیاوێكی ...

كەوابێ مرۆڤ ڕەنگی مرۆڤ ئەگرێ، خووی یەك ئەگرن، نەك هەر تەنها دەم و چاو و شكڵ وشێوەی ، له ویژدانیا به خۆی نازانێت، له ناخیا له ڕوحیا، له عومق و قوڵایی بونیا، لاسایی ئەو كەسه ئەكاتەوە كه كاریگەرە پێی، ئەم خەڵكه لاسایی هونەرمەندو گۆرانی بێژو ئەوانەی كه پێیان ئەڵێن نجوم، خۆی له ڕاستییا ظلوماتن ، ئەستێرە نین، كەچی پێی كاریگەرە، كابرا خۆ نەهاتووە مێشكی هەڵكەنێ و تێی بخات

و نەهاتووە وای لێبکات، ئەوەندەی فێر کردووە، ئەوەندە لە دەوری دانیشتووە، ئەوەندە های هۆی بۆ کردووە، ئەعصابی خۆی تێك داوە، یان ئەرەوەڵا گۆڵ بردییەوە، ماڵەکە ئاگری تێ بچێ و دز تاڵانی بکات بەخۆی نازانێت، ئەڵێ وەڵا نەمانزانیوە، لەبەر ئەم تۆپێن و شتانە چەند ژن تەڵاق دراوە، ئا بەم شێوەیە غەزووی ئەکات، ئیستیعابی ئەکات تا وای لێئەکات لەشی لەلای ئێمەیە و عەقڵ وویژدانی لای تۆپێن و شتی تر دەبێت.

کەوابێ ئەمڕۆ کۆمەڵێك وەسائیل هەن، لە وەسائیلی مواصەلاتی، بەڕاستی ئەگەر ئەمڕۆ ووریا نەبین، زۆر ژیر نەبین و زۆر خوا پێداو نەبین و دەستمان بە دەستی خوا پێداوێکەوە نەبێت، ئەخورێین و ئەدزرێین.

سەرم سوڕ ماوە بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ لە حەدیسی قودسی کە خۆشەویست بۆمان ئەگێڕێتەوە و ئەفەرموێت: ﴿إني خَلَقتُ خَلقاً حُنَفاءَ ثُمَ جائَتُهُمْ الشَياطِينُ فاجتالنهم﴾من دروستکراوەکانی خۆم هەمووی، (سبحان الله)، ﴿كُلُ مولودٍ يولَدُ على الفطرة، فأبواهُ يهودانهِ او يمجسانهِ او ينصرانهِ﴾ .

هەموو كەس لەسەر پاكی و جوانی لەسەر ویژدان دروستی، لەسەر عەقڵ دروستی، لەسەر پاكی دروست ئەبێت، بەلاَم دوایی كۆمەڵگای بچووك كە دایك و باوكن یان كۆمەڵگای گەورە كە جامیعەو دەزگاو حكومەت و وەزارەت و پەرلەمان و ئیقتیصادو سیاسەت و هونەرو عیلم و ڕۆشنبیرە ، ئەمە هەمووی دەورو بەرن كە ئەیكەن بە یەهوودی یان مەجوسی یان نەصرانی، ئەی بۆ نافەرموێت: یُسلِمانِهِ ، چونكە فیترەتی خۆی ئیسلامە، ئیسلام خۆی فیترەتە، نافەرموێت: (یسلمانه)، چونكە یولَدُ علی الأسلامْ ، (الفطرة) یەعنی ئیسلام.

﴿فِطرةَ اللهِ التي فَطَرَ الناس عَلَيها لا تبديلَ لِخَلقِ الله ذلِكَ الدينُ القَيمْ وَلكن اكثَرَالناسِ لايَعلَمون﴾

خۆشەویستان: بەڕاستی ئیمامی عەلی قەصیدەیەكی زۆر گەورەی هەیە لە چەند بەیتێكدا ئەفەرموێت: ﴿فَلا تَصحَبْ اخ الجَهلِ فأياكَ وَ أياهو فَكَمْ مَن جاهِلٍ أدرى حليماً حينَ أخاهُ﴾ ئەفەرموێت: نەكەی ئەی مرۆڤی ژیرو جوان ئەی كیژی جوان، ئەی خەڵكی ژیرو دڵسۆز، ئەی باوك و باپیران،

ئەی مامۆستاو كەس و خاوەنی منالْ ، نەیەڵن منالّەكانتان دوای جاهیل و بێ عەقلْ بكەون، ئای چەند جار بینیومە خەڵكی نەفام خەڵكی بە نەفامی لە خشتە بردووەو لە ڕێگە لای داوە، بەڵام كەم جار ئەبینی جگەرەكێش خەڵك فێر بكات كە جگەرە نەكێشێت، بەڵام كەم جار ئەبینیت كە جگەرە نەكێشێك وا بكات كە جگەرەكێشێك واز لە جگەرەكێشان بهێنێت، زۆر جار ئەبینین لەناو سندوقە سێوێكدا یەك دانەی كرمۆڵْ بووەو گەنیوە، هەموو سندوقەكە بۆگەن ئەكات.

ئەمانەمان بینی، ﴿هذا خَلقُ اللهِ﴾ سوننەتی خوا (سبحانَهُ وتَعالى) وایە، لەبەر ئەوە چارەسەر ئەوەیە ﴿فلا تَصحَب اخ الجهلِ فأياكَ وَ اياهُ﴾ نەكەی توش بی چونكە ڕەنگی وەرئەگری، هەركەسێك لەگەڵْ هەركەسێك بوو، ڕەنگی ئەو كەسە وەرئەگرێت، (خليل) لە زمانی عەرەبیدا یەعنی ئەو كەسانەی كە شێلدراون بەسەر یەكتریدا و زۆر تێكەڵن، ئەڵێن: تخليلُ اللحِية : یەعنی دەست بخەرە ناویەوە، تَخليل أصابعُ اليَدينِ وَالرجلين : ئاوا دەست هەڵپێكە تیایدا، (خليل) ئەوەیە، جا (خەليل) دوو بەشن: یەكێكیان ئەوەیە كە

خوا ئەفەرموێت: ﴿يَومَ يَعضُ الظالِمُ على يَديهِ يَقولُ يا لَيتَني اتَخَذتُ مَعَ الرَسولِ سَبيلاً﴾ .

دووەمیان: ﴿يا وَيلَتَا لَيتَني لَمْ اتَخِذ فلاناً خَليلاً﴾ . یەکێکیان (مع الرسول سبيلا)یە، ئەوە خەلیلی صالّحە، یەکێکیان: ﴿يا وَيلَتَا لَمْ اتَخِذ فلاناً خَليلاً لَقَد اضَلَني عَنْ الذِكر بَعدَ إذ جاءني وكانَ الشيطانُ للأنسانِ خذولاً﴾ . بەردەوام شەیتان فێلْ لە مرۆڤ ئەکات . بۆچی خوا ئەفەرموێت:﴿الَمْ اعْهَدْ إلَيكُمْ يا بَني آدَمَ انْ لا تَعبُدُ الشَيطانَ إنَهُ لَكُمْ عَدوٌ مُبينْ﴾ . لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿إنَ الشَيطانَ لَكُمْ عَدوٌ فاتَخذوهُ عَدواً إنَما يَدعوا وأحزبَهُ لِيَكونوا مِنْ أصحابِ السَعيرْ﴾ .

(سبحانَ الله)، بۆیە قورئانی پیرۆز هەمووی تزکیراتە . یەکێك لەناوە پیرۆزەکانی قورئان بریتییە لە (الذكر ) بەڕاستی مذكرة بەڕاستی قورئان هەمووی زیکرو زیکرەیاتە، هەمووی تەزەکوراتە، بۆ ئەوەی ئەم مرۆڤە بە ئاگا بێ و لە خشتە نەبرێ و بە ئاقاری خراپ دا نەڕواو لەگەڵ خەڵکی خراپ دا هەنگاو نەنێ و تێکەڵ نەبێت.

خۆشەویستان: كەواتە دوو جۆر خەڵك هەیە كە یەكێكیان واجبە لەگەڵی بی و یەكێكیان واجبە لێی دوور بكەویتەوە، وەكو چۆن دوور ئەبی لە دۆزەخ لە نەخۆشی لە هەر شتێكی ناپاك و ناچاك. بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەكی جوانیدا نموونەیەكمان بۆ ئەهێنێتەوە لە نموونەی پیاوی باش و لە نموونەی پیاوی خراپ: ﴿مثلُ الجليسِ الصالح وجليس السؤ﴾ ئەفەرموێت: ڕەفیق و هاوڕێی باش وەك و بۆن فرۆشێك وایە، وە هاوڕێی خراپ وەك ئاسنگەر وایە.

چا وەكو شاعیر ئەڵێت: هەر كەسێك لە لای ئاسنگەر دابنیشێتت یان سەری دێشێت، یان جلی ئەسوتێت.. (سبحان الله) چەند گەورەیە ، یەكێكیان: (بائُع المسك)، وە ئەوی تریان: (نافخ الكير).

ئەم دونیایە پڕیەتی لەم دوو جۆرە ، یەكێكیان میسك ئەفرۆشێت كە ئەعلی دەرەجەی بۆن خۆشییە، هەیشە بۆنی خۆی لێ بەرز ئەبێتەوە، هەمیشە هاڵاوی خۆشی ئەچێت بەسەری خەڵكا وەكو ئەچێت بەسەر خۆیا، هەندێكیش فو

ئەكات ئەوەی كە ئاسنی پێ ئەتوێنێتەوە لە ئاگر، فووی پیا ئەكات بەم شێوەیە ئەم بۆنە ناخۆشە ئەچێت بەسەریا، وە ئەو كەسەی كە لە لای دائەنیشێت، وەختێ كە هەڵئەسێت جلەكانی هەموو بە بریسكەی ئاگر سوتاون، ئەگەر هەر لەوەش ڕزگاری بوو بەڵام لە زیانی بچووك ڕزگاری نابێت كە بۆنی ناخۆش ئەچێت بەسەریداو توشی سەر ئێشەی ئەكات لە ئەنجامی ئەو دووكەڵ وبوخارەی كە ئەچێت بەسەریا.

جا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێت: ئەی مرۆڤی ژێر لەلای میسك فرۆش دابنیشە، ئەگەر لێی بكڕی ، ئەوە بۆن ئەكڕی و بۆنی خۆت خۆش ئەكەی، بۆنت ئەچێت بەسەر ماڵ ومناڵ و گەڕەك و دراوسێدا، ئەگەر ئەوە نەبێت ئەو بۆنە هەر تا دێر زەمان ئەمێنێتەوە، بۆ نموونە: لەناو خەڵكی بۆن خۆش دا دانیشە یان لەناو پاسێك یان مەجلیسێك جگەرە ئەكێشن، ئیتر ئەوەش كورەچی و ئاسنگەرە، جگەرەكێش لەم جۆرەیە، یەعنی مامۆستاو مەلای بەڕێزم بینیوە هەموو جلەكەی كون كون بووە، بەخێرو بەركەتی جگەرە.

جا فیعلەن (نافع الکیر) یەعنی چی، وەڵا جوانترین نموونە جگەرەکێشە، ئەوە خۆی هەر بە تاوانبار نازانێت، مرۆڤ هەیە خوا هیدایەتی داوە جگەرەی واز لێهێناوە، دوای دە ساڵ زانیویەتی چەندە تاوانی کردووە، چ جەریمەیەکی کردووە بە حەقی ژینگە، بە حەقی ئەو ئەمانەت و لەشە جوانەی کە خوا پێی داوە، بەرامبەر ئەم هەموو ئەجهیزە، بەرامبەر بە برادەر ، بەرامبەر ژنە هەژارە ستەم لێکراوەکەی، بەرامبەر بە ماڵ ومناڵەکەی، چەندە منداڵی خۆی فێر کردووە، چونکە وتویەتی جگەرەکەم بۆ داگیرسێنە، یەعنی خۆتان بسوتێنن، ئینتحار کەن، بەڵام بەجۆرێکی (کینایە) بە (تعریض) نەك بە (تصریح) و(الکنایة ابلُغُ مِن التصریح).

بەڵێ خۆشەویستان: لەفەرموودەیەکی تردا خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿الأخلاءُ يَومئذٍ بَعضُهُمْ لِبَعضٍ عدو الا المُتَقينْ﴾ .

کەوابێ ڕەفیق هەیە موتەقینە، پارێزکارە، ئەوە لە دونیادا هەر دۆستەو لە قیامەتیشدا هەر دۆستە، چەند حەدیسمان هەیە کە تەئکیدی ئەکاتەوە کە هاوڕێ شەفاعەت

ئەكات بۆ هاوڕێ، مامۆستا ئەیكات بۆ قوتابی، قوتابی ئەیكات بۆ مامۆستا، منالْ ئەیكات بۆ دایك وباوك ، دایك و باوك ئەیكەن بۆ منالْ، ژن بۆ مێرد، مێرد بۆ ژن، ئەمانە ڕەفیقی یەكن هاوڕێ و هاوسەری یەكن، مرۆڤی واش هەیە ئەڵێت یاڕەبی وەڵا من ئامادەم بچم بۆ جەهەننەم ، ئەویش لەگەڵم بوو چووین زیناكەمان كرد، تا نەیبات بۆ جەهەننەم ئیسراحەت ناكات و ئۆقرە ناگرێ، (إلا المتقين ) هەموو دۆست و هەموو برادەرێك لە ڕۆژی قیامەت دا ئەبنە پارێزەرو شكات لە یەكتری ئەكەن، دژی یەك ئەوەستن و یەكتری ئاشكرا ئەكەن، یەكتری حەیا ئەبەن، ئەوەی كە بەسەرخۆشی و پێكەوە پێكیان هەڵئەداو پێئەكەنین و ئاوایان ئەكردو بەدەستووری ئەو سەرخۆشانە، یان ئەوەی كە وا ئەڵێت كورە بابە وەرە لەسەر من بخۆرەوە، پاكەتە جگەرەكەت لەسەر من ، كاری فاحیشەت لەسەر من، ئەوانە ئەو دۆستە جەهەننەمیانەن، كە بەدەم یەكەوە پێ ئەكەنن و یەكتری ماچ ئەكەن و بەیەكەوە سەرخۆش ئەبن و هەڵبەزو دابەز ئەكەن و ڕەقص وسەما ئەكەن، ئەمانە دواپاكیان ئەبنە دوژمنی

یەکتری، ئەبنە بڵاوکەرەوەی عەیب وعاری یەکتری، چییان بینیوە هەمووی ئەگێڕنەوە بۆ فریشتەو مەلائیکەتەکانی خوا، خوا خۆشی ئاگادارە بە هەمووی، بەلاّم باوەڕداران خوا پێیان دەفەرموێت:﴿يا عِبادِ لا خوفٌ عَلَيكُمْ اليومَ وَلا أنتُمْ تحزنونْ﴾. لە ئەنجام دا ﴿ادخُلُوا الجنة أنتُمْ وَأزواجُكُمْ تُحبِرونْ﴾ ئەچنە بەهەشتی پڕ لە حورو سرور ، کەوابێ ڕەفیق و هاوڕێ، ﴿المرءُ على دينِ خَلِيلِهِ﴾ هەموو کەس لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی، جا ئەگەر تۆ هاوڕێیەتی مرۆڤی دیندارو چاکت کرد، تۆش چاك و بە دینی، ئەگەر هاوڕێی بێ دین و لارت کرد، ئەوە تۆش بێ دین و لارو ماڵوێرانی، بەخۆت نازانی ماڵت وێران ئەکات.

بەڕاستی چەند کەس بووە لە مێژوودا زۆر باشی هێناوە، کوڕە باش و کوڕە شێخ و کوڕە مەلاو کوڕە پیاو کوڕە بنەماڵەو هیچی کەم نەبووە، بەڵام بەهۆی هاوڕێیەتی خراپەوە لە ناوەڕاستی ڕێگادا لە خشتە چووە، بەهۆی جگەرەکێشانەوە، بەهۆی قومار کردنێکەوە، بەهۆی قوتە قوت و مێ بازییەوە، بەهۆی سەرخۆش بوون و بەهۆی

هیجرەت و كۆچ كردن، چەند منالی موسوڵمان بەهۆی هاوڕێی خراپەوە چوو بۆ كۆچ كردن، چەند منالێ موسوڵمانی هەژار هێشتا تەمەنی دە ساڵ وكەمترە، بەهۆی سەیرانەوە دەستی كردووە بە بیرە خواردنەوە، كە بینیویانە ئەفەندییەكان چوون قوتووەكە فڕێ ئەدەن ، بەچاوی خۆمان بینیومانە كە دوو منالێ بچووك كە دەستیان گەیشتووەتە قوتووە بیرە خواردویانەتەوە، لەسەرەتاوە وا فێر بووە كە قوتوی نیوەی فڕێدراو بە نیوەیی، ئەو منالە هەژارانە، باوەڕتان هەبێت تەمەنیان هەشت و دە ساڵ كەمتر نەبووە یەقینم هەیە، ئەوە ئەبێ چ تاوانێ فێر ببێت، ئەگەر ئەو منالە نەچێتە ئەو شوێنە بەڕەڵایانە ، بۆ نموونە ئەو موراهیقانە كە ئەچنە ئەو ڕەش بەڵەكانە كە لە عەسری جومعەدا ئەم شوێنانە قەرەباڵغ ئەبن، بە دەهۆڵ لێدان و بە ڕەش بەڵەكی ئەم شوێنە نا موبارەكانەی دەورو بەرمان، یەعنی ئەبێت چەند منالێ ئاوا فێر ببێت و قوڕ بەسەر ببێت، باشە ئاخر هەر منالێ بەو ڕەش بەڵەك و سەیرانگایە ئەبێ بە میكرۆب و ئەبێ بە مشك ئەبێ بە مار ، ئەبێت بە هەژدەها ئەبێت بە

ڤایرۆس، ئەبێت بە ئایدز، بۆ کێ ؟ بۆ کچی من و خوشك و کچی تۆ، کە گەڕەك و جادەو کۆڵان و ئیقتیصاد و ئابووری وێران ئەکات، قاو قیژ ئەکات و غەوغا دروست ئەکات لەناو کۆمەڵگادا ، ئەی بۆ نازانین بەم شێوەیە کۆمەڵێك مارو دوو پشك بۆ خۆمان دروست ئەکەین ، کۆمەڵێك ئاگر بۆ ماڵی خۆمان و کۆمەڵێك نەگبەت و شەلاتی دروست ئەکەین بۆ نامووسی خۆمان ....

ئەمە جەریمەیە کە ئەیکەین، چۆن کاریگەری نییە بۆ سەر خەڵك ، چەند کەسی باشمان بینی کە لە خشتە چوون.

ئەمە هەمووی کاریگەرییەکە باسم کرد، بەڕێزەکانم پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێك صەحابەدا دانیشتبوو، پیاوێك هات و گەیشت بە پێغەمبەری خواو باسی کاریگەری هاوڕێ لەسەر هاوڕێی و لەسەر دەوروبەری خۆی ، ئەوجا صەحابەیەك پرسیاری کردو فەرمووی: باشە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵا من زۆر بەداخم ئەگەر یەکێك ئاوا کردەوەی باشی نەبوو ، بەڵام چونکە پێغەمبەر کۆمەڵێك شتی باس کرد، فەرمووی: ئەبێت موسوڵمان ئاوا بێت،

فه‌رمووی: ئه‌گه‌ر هیچیانی نه‌بوو له‌مانه‌ به‌س یه‌ك شتی هه‌بوو، پیاوی باشی خۆش ئه‌ویست ، ئه‌وه‌ حوكمی چییه‌ ؟ ئه‌وه‌ تۆ بڵێی یه‌كێك بێت له‌ قیامه‌تا ﴿انتَ مَعَ مَنْ احبَبْتَ﴾ ﴿إنَكَ مَعَ مَنْ احبَبتْ﴾ به‌ڵێ ئه‌و كه‌سه‌ له‌ ڕۆژی قیامه‌تا له‌گه‌ڵ ئه‌و خۆشه‌ویسته‌ی خۆیدا حه‌شر ئه‌كرێت، هه‌ر ئه‌وه‌ گه‌وره‌ترین جائیزه‌یه‌، وه‌ گه‌وره‌ترین جه‌واز سه‌فه‌ره‌ وه‌ گه‌وره‌ترین ده‌ستكه‌وت و ده‌ستمایه‌یه‌ به‌ڕاستی.

كه‌ خه‌ڵك هه‌وڵی بۆ نادات داخی گرانم، یه‌عنی ئێمه‌ گه‌ر ژیر بین خه‌ڵكانی باشمان خۆش ئه‌وێت، هه‌ر خۆشمان چاك نه‌بین با ڕێز له‌ پیاوی چاك بگرین، ئه‌گه‌ر خۆمان مه‌رد نه‌بین با پیاوی مه‌ردمان خۆش بوێت، ئه‌گه‌ر خۆمان نوور نه‌بووین باڕێز له‌ نورو نورانییه‌كان بگرین، ئه‌گه‌ر خۆشمان ڕاكیع و ساجید نه‌بووین با ڕێز له‌ ڕاكیع و ساجیده‌كان بگرین، ئه‌وه‌ بۆخۆی ده‌ستكه‌وتێك و شه‌فاعه‌تێكه‌، ئه‌و ئه‌ده‌ب و حه‌یایه‌ ڕۆژێك فریات ئه‌كه‌وێ و ئه‌تگێڕێته‌وه‌ ، ئه‌گه‌ر خۆت ڕیشت به‌به‌ر خۆره‌وه‌ سپی كردبوو ڕێز له‌ ڕیش سپی بگره‌ كه‌وا له‌ سوجده‌و له‌ ركوع و له‌ شه‌و نوێژو له‌ خه‌ڵوه‌تا ڕیش و سه‌ری

سپی کردووە، ڕێز لەوە بگرە کە ئەو ئەتگێڕێتەوە لە خراپە، هەر ئەوە کە ئەتبەستێتەوە بە دینەوەو بە حەقودیندارانەوە، بەڵێ مەشهورە سبەینێ ﴿يَحْشَرُ المَرأُ مَعَ مَنْ احَبَهُ﴾ .

کەواتە خۆشەویستان: زۆر گرنگە کە خەڵکی وات خۆش بوێت، کەیفی بە مرۆڤی باش بێت، کەیفی بە کتێبی باش بێت، بە مەنهەجی باش بێت، بە لایەنی باش بێت، بە مەشروعی باش بێت، بە فیکرەی باش بێت، بە پرۆگرامی باش بێت، بە یاساو قانونی باش بێت، بە نیظامی باش بێت، بە سیستەمی باش بێت، بەهەر شتێکی باش کە قازانجی لێ ئەکات، ئەوەش جۆرە وەلائیکە.

ئەو جۆرە وەلائو کەیف هاتن و خۆشحاڵ بوونە بە چاکان و بە پاکان، ئەوە بۆ خۆی عیبادەت و دینە، بەشێکە لە دین، هەر خۆشەویستییە. بۆ نمونە: ئەگەر تۆ کەسێکی باشت خۆش ویست، بە گوێشی دەکەی. ﴿إنَ المُحِبَ لِمَن يُحِبُ مُطيعُ ﴾.

تۆ ئەگەر پیاوێکی باشت خۆش بوێت لە ئەنجام دا بە گوێی ئەو پیاوە باشە ئەکەی ، ئەگەر لایەنێکی باشت خۆش

بوێت، ئەگەر ڕادیۆیەکی باشت خۆش بوێت گوێی بۆ ئەگری، ئەگەر تەلەفزیۆنێکی باشت خۆش بوێت سەیری ئەکەی، مەجلیسێکی باشت خۆش بوێت ئەچیتە ناو مەجلیسەکە، کام مزگەوتت خۆش بوێت سەردانی ئەکەی، مامۆستایەکی باشت خۆش بوێت، گوێی لێئەگری و بەهرەی لێوەر ئەگری و نووری لێوەرئەگری و خۆتی پێ ئارایش ئەدەیی و خۆت ئەکەی بە هاوڕێی و نزیك ئەبیتەوە لێی، ئەگەر بچکۆلەش بیت خۆت ئەکەی بە سفری پاڵ یەك، واتە سەیرکەن خۆشەویستان، سفر زۆر بچووکە بەڵام ئەگەر لە پەنای یەك دا دای بنێی بزانە چۆن ژمارەکە ئەگۆڕێت، چۆن خۆی ئەکات بە شت، ئەگەر هەر سفریش بێت بەلاّم کە لە تەنیشت ژمارەیەکی تردا وەستا بزانە چۆن حسابی بۆ ئەکرێ و گەورە ئەبێت، ئەویش گەورە ئەکەی و خۆشت گەورە ئەبیت، یەعنی ئەگەر هەر نەبوو نەبوو، با مرۆڤ وابێت ، بەڕاستی ئەمە زۆر گرنگە ، کەوا ئەگەر مرۆڤی خراپیشت خۆش ویست بە گوێی ئەکەی، زۆر کەس هەبووە ووتویەتی کاکە بخۆرەوە، فەقیرە لە ژیانیا نەیزانیوە خواردنەوە چییە،

بەلاّم لە شەرما خواردوویەتییەوە، تا قوڕی بەسەر بووە، دەبخۆ لێدە، یان بەرتیلیان پێ خواردووە، یان درۆیان پێکردووە یان وەصڵیان پێپڕ کردووەتەوە...

بابە بە گوڵێ بەهار نایەت، ئاخر تۆ ئاگر بیت کوێ ئەسوتێنی ؟ ئەم قسە بێمانایانە، ئەو شتە جەبرییانە، ئەوە شتی جەبری پێ دەڵێن، لەم خۆ گێل کردنە، توخوا ئەمە خۆ گێل کردن نییە ؟! چۆن بە گوڵێك بەهار نایەت، ئەوە بەڕاستە بەگوڵێ بەهار نایەت، وەڵا لە پێشدا یەك گوڵ دەردێت، ئەوجا بە یەك کەڕەت ئەبن بە هەزار گوڵ، هەموو شتێك وایە لە پێشدا یەك شت بووە، مرۆڤیش هەر وا بووە، لە پێشا ئادەم بووە، دوایش حەوا بووە...

ئاگرە سورە لەخۆم دوورە، یان دەنکە شقارتەیەك بیت کوێ ئەسوتێنی، مەگەر دەنکە شقارتەیەکت نەبینیوە شارێکی سوتاندووە ؟ مەگەر ئاگری گەورە لە چییەوە دەست پێئەکات ؟

﴿وَمُعَظَمُ النارُ من مستَصغَرِ الشَرَرِ﴾ وەکو ئیمامی بەیضەوی ئەفەرموێت: ئەمانە هەمووی ئەو کابرایە خۆی

گێلەو ئەیەوێت خەڵکیش گێل بکات و یەك فەیلەق گێل لەگەڵ خۆی بهێنێت، لە دونیاو قیامەتا ئەوە زۆر ترسناکن ئەو قسە پوچانە بۆ سەر دین و بۆ سەر مەردایەتی و جوامێری، با ئەو شتانە لە مێشکمانا بسڕینەوە ...

کەوابێ ئەگەر پیاوی خراپیشت خۆش بوێت، هەر بە گوێی ئەکەی ، کە بە گوێتکرد بە ئاقاری ئەودا ئەچی و لەسەر دینی ئەو حەشر ئەکرێیت.

﴿وَمَنْ يَتَوَلَ اللهَ وَرَسولَهُ وَالذينَ آمَنوا فانَ حِزْبَ اللهِ هُمُ الغالِبونْ﴾

داوا ئەکەم لە خوای پەروەردگار ئەو ڕاستییانەمان تێ بگەیەنێت ، ئەو ئەخلاق و ڕەوشتە بەرزانەی کە وتمان خۆمانی پێ ئارایش بدەین و خۆمانی پێ جوان بکەین و وە زۆر زۆر ڕاشکاوانەو مەردانەو جەسورانە پیاوی باشمان خۆش بوێت، لایەنی باشمان خۆش بوێت، فیکری باشمان خۆش بوێت، شریتی باشمان خۆش بوێت، کتێبی باشمان خۆش بوێت، مامۆستای باشمان خۆش بوێت،ماڵی خوامان

خۆش بوێت، شوێنی خراپمان ڕق لێبێت، وەلائو وەفامان بۆ خواو پێغەمبەر بێ ، وەکو خوای پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَتَوَلَ اللهَ وَرَسولَهُ وَالذينَ آمَنوا فَانَ حِزْبَ اللهِ هُمُ الغالِبونْ﴾

کەوابێ وەلائمان بۆ خواو پێغەمبەرو ئیمانداران بێت بۆ ئەوەی حیزبی خوا بین.

داوا ئەکەم لە خوای بە دەسەڵات ، خوای گەورە ئەوەی وەکو ووتمان، ئەوەی کردمان، ئەوەی پێشکەشمان کرد، بە زیادەوە لێمان وەربگری، هەر کەلێن و نەقصێك هەبێت لە عیبادەتمانا ، هەر خەلەلێك هەبێت لە دڵمانا، (نسیان)و (عصیان) هەبوو، خوای گەورە قەڵەمی عەفو بێنی بەسەریاو ڕەشی بکەیتەوە ... وە بیگۆڕی بە چاکەو باشە بۆمان. ﴿يُبَدِلُ اللهُ سَيئاتِهِمْ حَسَناتْ وَكانَ اللهُ غَفوراً رَحيماً﴾ .

داوا ئەکەم لە خوای پەروەردگار تەمەنمان درێژ بکاو بمانهێڵێتەوە بۆ ئەوەی زیاتر کردەوەی چاکە پێشکەش بکەین بە قیامەتە نەبڕاوەکەمان.

اللهُمَ آمیـــــــــــــن ...

# ﴿واتای بەندایەتی﴾

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ ... **يَقولُ سَبحانَهُ وتَعالى ..**

﴿إنَما كانَ قَولَ المؤْمنِينَ إذا دَعَوا إلى اللهِ وَ رَسولِهِ لِيَحْكُمَ بَينَهُمْ أنْ يَقولوا سَمِعْنا وَأطَعْنا وَأولَئكَ هُمُ الُمفلِحونْ﴾ ...

**يَقولْ عَلَيهَ الصَلاةُ وَالسَلامْ** :﴿عُرِضت عَلَيهِ أعْمالُ أُمَتِ حَسَنُها وَ سَيِئُها .. وَ رَأيتُ مَن مَحاسِنَ أعمالِنا إلاماطةُ الأذى عَنْ الطَريقْ﴾ ...

**موسوڵمانە بەڕێزەكان، خوشك و برا ئیماندارەكان: سەلام و ڕەحمەتی خوای گەورەتان لێ بێت، بەردەوامین لەسەر شەرح و ڕاڤەی** ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ **بەردەوامین لەسەر ڕوون كردنەوەی وەضیفەو پلەو پایەی بەندایەتی : لە ووتاری ئەمڕۆشمان داو لەو بوارەدا ئەڵێین:** ﴿وَباللهِ التَوفيقْ﴾ **كورت و پوختی مانای بەندایەتی .. بەندایەتی كە وەزیفەی پەیامی ئێمەی مرۆڤە لەسەر ئەم زەوییەدا، بریتییە لە دوو خاڵی گەورەو سەرەكی، كە هەر**

یەكێك لەم دوو خاڵە دەیان لیستی كارو بەرنامەو هەنگاو و هەڵوێست و كردار ئەبێت:

**یەكەم:** بریتییە لەوپەڕی خۆشەویستی بۆ خوا: ئەو پەڕی خۆشەویستی كە لە مێشكت دا دائەبەزێت و بۆ ناو دڵ وناخ و دەرونت، ئەوجا دائەبەزێت بۆ پەنجەو دەست و چاو و گوێ و هەنگاو و هەڵوێستەكانت، بۆ كردارو گوفتارت، ئەو پەڕی خۆشەویستی كە لە كیان و قەوارەی تۆدا هەبێت، ئەوەندە دڵ وویژدانت پڕ بێت لە خۆشەویستی خوا، كە ئیتر خۆشەویستی هیچ كەس و هیچ لایەن و هیچ بەرنامەو پرۆژەیەكی تری تێدا جێ نەبێتەوەو بوارو مەجال نەدات ، وەها پڕ بوبێت ، جێگەی خۆشەویستی هیچ كەسێكی تری تێدا نەبێتەوە...

**دووەم:** ترسان لە خوای گەورە ﴿سُبحانَهُ وَتَعالى﴾ .. زەلیلی و ملكەچی بۆ خوا، ئەویش بەو شێوەیە كە ئیتر ئەوەندە زەلیل و ملكەچ بیت، ئەوەندە گوێڕایەڵ بیت، ئەوەندە بكەوی لەبەردەم شەریعەتی خوادا، ئیتر هیچ زەلیلی و هیچ چاوشۆڕی و هیچ فەقیرییەك و هیچ هەژارییەك

دەرنەبڕی بۆ غەیری خوا، واتە: ئەوپەڕی زەلیلی و ئەوپەڕی خۆشەویستی ، جا ئەمجارە بزانی کە ئەم دوو چەمکە گەورەو گرانە دابەش ئەبێت بەسەر سێ ڕوکنا، سێ لق وپۆپی هەیە.

أ . بەشی دڵ ..... ب . بەشی ئەندامەکانی چاو وگوێ و

دەست وپەنجەو قاچەکان... ج . بەشی زمان.. . ئەوەی کە بەدەم ئەوترێ ، بەقەڵەم ئەنوسرێ، ئەم سێ ڕوکنە ئەبێ هەمووی ئاڕاستە بکرێ بۆ خوا، وە ئەبێ سەربازی خوا بێت، بە تەواوەتی ڕوویان لە خوا بێت...

وە ڕازی بن بەخوا، کە زمان قسەی کردو هاتە قسە، کە خوا لێی ڕازی بێت، خوا پێی خۆش بێت، کە ئەندامەکان جوڵان وحەرەکەتیان کرد، وەها جموجوڵ بکەن کە خوا پێی خۆش بێت و دژی بەرنامەو شەرعە خوا نەجوڵێنەوە.

دڵ:. پڕی بێت لە تەوەکول و لە خۆشەویستی و لە پشت بەستن بەخوا، لە ترس و بیم لە خوای گەورە، ئیتر جێگەی شتی تری. تێدا نەبێتەوە ، هەتا هەناسەکەمان وا بەرنامە ڕێژی بۆ بکەین کە لەبەر ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بێت،

چونكه ئەم قەوارەی مرۆڤه من و تۆ به هەموو لەشمانەوه له تەوقی سەرمانەوه تا نوكی پێمان ، له دڵمان تا زمانمان و تەواوی ئەندامەكانی لەشمان هەمووی موڵكی خوایه...

بەڕاستی ئەم سەربازانەی خواو ئەم موڵكانەی خوا ئەبێ وەها بجوڵێ و وەها بڕواو وەها بڵێ و وەها قبوڵ بكات، كه خاوەنەكەی پێی خۆشه، ئێمه هی خواین و خوا مالیكی ئێمەیه، خوا مەلیكی ئێمەیه، هەر ئەمرێك بكات ئەبێ دەست بەجێ جێبەجێی بكەین، بەرگریمان ئەكات بڵێین بەڵێ، خوا (سبحانَهُ وَتَعالى ) ئەفەرموێت: ﴿أُمِرتُ وَنَهيتُ﴾ . ئێمەش بڵێین: ﴿سَمِعنا وَ اطَعنا﴾

خوا ئەفەرموێت: عەبدەكەم من بەرگریت پێئەكەم و ئەمرت پێئەكەم، ئێمەش بڵێین: بەڵێ خوایه گیان گوێم لێیەو بەقسەت ئەكەم، چی ئەفەرمووی وا ئەكەم و وا ئەڕۆم و وا ئەڵێم، وه به موو له شەریعەت و بەرنامەی تۆ لانادەم، ئەمه وەزیفەی بەندایەتی ئێمەیه بەرامبەر به خوای گەورە، ئەم بونەوەره چەند جوان و ڕێك و پێك ئەڕوات و دێت و دەچێت، هەمووی لەسەر نەخشەو بەرنامەیەكه كه خوا بۆی داناوه،

دەعم ناكەن و ئازاری یەكتری نادەن، تۆپ وساڕوخ و كوشتن و بڕین ناكەن، سنوری یەك داگیر ناكەن و ئەڵێن: ﴿سَمِعنا وَ أطَعنا﴾ هەر ئەو وەعدو بەڵێنەی كە داومانە، ئەو ئەستێرەو مانگ و ڕۆژەش هەر ئەو بەڵێنەیان داوە، بەس ئەوان بردویانەتە سەر، بەڵام ئێمە جار جار لێمان تێك ئەچێت ، یان لە بیرمان ئەچێت، یان لە خشتە ئەبرێین، یان فێڵمان لێئەكەن و ئەمانشێوێنن، بەشوێنی خراپ، یان بەكۆمەڵگەی خراپ، یان قوتابخانەی خراپ، یان جامیعەی خراپ، دەوروبەری خراپ، ژینگەی خراپ، تەلەفزیۆنی خراپ، ڕادیۆی خراپ، بەرنامەی خراپ، قێزەونمان ئەكات، زەلیلمان ئەكات، نەخۆشمان ئەخات، دەردەدارمان ئەكات، لە خشتەمان ئەبات، لە (صراطَ المُستَقیمْ )ەوە ئەمانبات بۆ (المَغْضوبِ عَلَیهِمْ) وَ(الضالِینْ) كە هەموو ڕۆژێ لە نوێژەكەمان دا باسی سێ صراط ئەكەین:

یەكەم: ئەڵێین خوایا (صراطَ المُستَقیمْ ) كە هی تۆیە بۆ ئەوێ هیدایەتمان بدە ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾دوو ڕێگەی ترهەن كە ئەنجامەكەی گومڕایی و وێڵی و سەرگەردانی و

چوونە جەهەننەمە، کە ئەویش : ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ خوا لەوانە لامان بدات،﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ ...﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ ئێمە هەموو ڕۆژێك ئەپاڕێینەوەو ئەم سێ دوعایە ئەکەین ، کە یەکەمیان ئاڕاستەمان بکە بۆ ئەو ڕێگایەی کە ڕێگای خۆتەو خۆت دیاریت کردووە بۆمان، هەر کەسێك بچێتە سەر ئەو ڕێگایە ئەچێتە بەهەشت، ﴿فَريقٌ في الجَنةْ﴾ ئەوانی تریش کە ڕێگەی﴿مَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ ئەوە ﴿فَريقٌ في السَعيرْ﴾ بۆ جەهەننەم ئەچن...

خوایا گیان لەو جەهەننەمانە لامان بدەیت، بمانخەیتە سەر ڕێگەی خۆت ، ئێمە هەموو ڕۆژێ ئەمە ئەڵێین، بەس جار جار لائەدەین و بەگوێی ناکەین، خۆمان لە گێلی ئەدەین و خۆمان خەریك ئەکەین بە شتی پڕوپوچ و بێماناوە، حەقی خۆمان لەبیر ئەچێ و حەقی خوا لەبیر ئەکەین، گوایا خەریکی حەقی خۆمانین، یان حەقی ژنمانە یان حەقی مناڵمانە، یان حەقی دائیرەو حیزب و بەرپرسیاری و بەو

ناوەوە... ناو زۆرە مرۆڤ خۆی پێ بخەوێنێ و خۆی پێ هەڵخەڵەتێنێ و خۆی پێ لە ڕێی ڕاست لابدات، تۆ بیست و چوار سەعات تەمەنت هەیە ئەتوانی ئەوەندە خوا ڕازی بکەی ، لەهەمان کات دا ئەتوانی دائیرەو حکومەت و ژن و ماڵ ومناڵ و مزگەوت و کۆمەڵگاو بازاڕو خەستەخانەو سەردان و سەیران هەمووی ڕازی بکەیت، بیست و چوار سەعاتەکە بەشی خەو و پێکەنین و ئیسراحەت ولەهولەعبیش ئەمێنێتەوە، بەڵام ئێمە بەداخەوە وەکو ئەستێرەو مانگ و ڕۆژ ناکەین، زوو لە خشتە دەرئەچین، وەکو ﴿وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ ناکەین و ئێمە لە ئەفلاکی تردا مەلە دەکەن ڕێگەی﴿مَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ﴾ بابۆتان ڕون بکەمەوە هی کێیە، کە هەموو ڕۆژێ چەند جار ئەپاڕێینەوە لە خوای گەورە کە لامان بدات لەو ڕێگەیە، ئەوە ڕێگەی کەسێکە زاناو دانا بێت کە بزانێت ئەوە خێرەو ئەوە شەڕە، ئەوە ڕەحمانە ئەوە شەیتانە، ئەوە ڕێگەی بەهەشتە ئەوە ڕێگەی جەهەننەمە، بەڵام هەندێك کەس ملی ڕێگەی جەهەننەم ئەگرێ وائەزانێ ڕێگەی بەهەشتە، پشت بکاتە ڕەحمان و ڕوو بکاتە شەیتان،

ئەوە ڕێگەی ﴿مَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ ی هەیە، یەعنی ئەزانێت ئەوە تەنورەو ئاگری تیایەو ئەیسوتێنێت، کەچی وەکو کەو باڵ ئەگرێتەوەو خۆی ئەخاتە ناو ئاگرەکەوە...

وەکو پێغەمبەری سەروەر ﷺ ئەفەرموێت: من وام لە دواتانەوەو ڕاتان ئەکێشم، کەچی ئێوە پەپولە ئاسا خۆتان هەڵئەدەن بۆ ناو ئاگرەکە، هەیە شارەزاشە و هەموو شتێك ئەزانێت حەرام حەڵاڵ، ئەزانێ عەرەق حەرامە ئەیخواتەوە، ڕیبا حەرامە ئەیخوات، درۆ حەرامە ئەیکات، ئازاردانی دراوسێ و خزم و خوێش حەرامە کەچی ئەیکات، ئەوە﴿مَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ە ، تۆ بزانی ئەوە صەدەقەیە کەچی پشتی تێبکەی، ناحەز دەهۆڵت بۆ لێئەدات سەمای بۆ ئەکەی، (ضالینْ ) ئەوەیە، کوێرە وێڵە، گێلە، سەرگەردانە، چەواشەیە، ڕێگاکەی وون کردووە، سەری لێشێواوە، ئەو هەموو خوێنە ئەڕژێ، خۆی ئەتەقێنێتەوە، ئەوە گومڕاییە، ئەوە (ضالینْ )ە، منالی خۆی هەتیو ئەخات، ژنی خۆی بێوەژن ئەکات، منالێ خەڵکیش وا لێئەکات، مالی خەڵکیش وێران ئەکات، مالی خۆیشی وێران ئەکات، بە فرمێسك و

باروت و دوکەڵ ، هەتیوی و هەژاری و داماوی ئەکات بە دیاری بۆ میللەتەکەی خۆی، بەناوی ﴿لاإلهَ إلا الله﴾وە، ئەوەش ﴿مَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ە ، جا ئەم دونیایە پڕیەتی لە (ضالينْ ) و ﴿مَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ .

جا برا موسوڵمانەکان: خوای گەورە لە سورەتی (الفاتحة) هەر سێ مەنهەجەکەی ڕوون کردونەتەوە، مەنهەجی پێغەمبەران کە (صراطَ المُستَقيمْ )ە، وە مەنهەجی گومڕایان و مەنهەجی ئەوانەی کە داناو زانان بەڵام خۆشیان ئەخەنە حەرام و هەموو شتێك ئەکەن و بەڵگەش دێننەوە بۆی، ڕیبا ئەخوات ناوی ئەنێت فائیزو ڕسومات، عەرەق ئەخوات ناوی ئەنێت مەشروباتی ڕۆحی، ئەمە لە کوێ مەشروباتی ڕۆحییە ؟ ئەی هاوار فێڵ لە خەڵکیش ئەکەن، خۆشیان گێل ئەکەن ، خۆشیان بەنج ئەکەن، خۆشیان سڕ ئەکەن، خەڵکیش سڕ ئەکەن، عالم و زانا بڕۆ ئەنوسێ و بەڵگە دێنێتەوە، بڕۆ کە دەم ئەکەیتەوە ناوی ئەنێت ئازادی، ناوی ئەنێت قەومیەت، ناوی ئەنێت شۆڕشگێڕی، ناوی

ئەنێت مۆدێرن، ناوی ئەنێت پێشکەوتنخوازی، ناوی ئەنێت دیموکراتی،مافی مرۆڤ.

جنێودان بە خوا پێغەمبەرو بە خێزانەکانی و بە صەحابەو بە عولەماو بە باو و باپیری خۆمان، هەموو ڕۆژێ نەفرەتیان لێئەکەن، لە تەلەفزیۆن و لە ڕۆژنامەکان، ئەوە ﴿مَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾

(ضالینْ ) یش، ئەو هەموو گێل و حۆل و گێژو وێڵەن، کە یەکتری ئەکوژن و یەکتری ئەبڕنەوە، بەناوی ﴿لاإلهَ إلا اللهُ﴾وە ، کەنیسە ئەڕوخێنێ و خەڵك ئەکوژێ، ئەمانە هەمووی (ضالینْ ) نن..

جا بەڕاستی ئەبێت هەموو ڕۆژێك بپاڕێینەوە لە خوا (تَضَرُعُ و تَذّلُلْ ) بکەین بۆ خوا ....

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ ئەمە هەمووی پێشەکییە بۆ ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾...

ئەم هەموو باسی ڕەحمان و ڕەحیم و بسم لله ، تا خۆت بکەی بە﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ دا.

تا دەرباز بیت لە ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ کە دونیا پڕیەتی لە ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾...

براو خوشکە بەڕێزەکانم: پێویستە ئێمە دڵمان عەبد بێت، زمانمان عەبد بێت، چاومان عەبد بێت، دەست و قاچمان عەبد بن، گوێمان عەبد بێت، ئەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێت: کە وەختێ بانگدەر ئەڵێت: ﴿حَي على الفَلاحْ﴾ یەعنی وەرن بۆ سەرفرازی، ئەبێت تۆش لە وەڵام دا بڵێی:

﴿لا حَولَ وَلا قُوَةَ إلا بالله﴾ . یەعنی من ئەم قاچانەم کە لە ماڵەوە هەڵم ئەگرن و ئەمهێنن بۆ مزگەوت و دێم بە دەم ئەم بانگەوازە خواییەوە، ئەوە خوای گەورە پاڵم پێوە ئەنێ و هەڵم ئەگرێ، چونکە خوا قاچی بۆ دروست کردووم و خوا هێزی داوە بە چۆکەکانم، ئەگەرنا ئەتوانێت لیم بستێنێتەوەو ناتوانم بجوڵێم. ئەبێ حەقی خوایان پێ جێبەجێ بکەی، ئەمە مانای﴿لا حَولَ وَلا قُوَةَ إلا بالله﴾یە، یەعنی کەس

ناتوانیٚ هەڵم گریٚت و بمگوێزێتەوە لەناو بازاڕو شەریکەو دوکان و بگرەو بەردەو کڕین و فرۆش داو بۆ چوونم بۆ ماڵی خواو بۆ لای ﴿حَي على الصَلاة ، حي على الفَلاحْ﴾ . باقاچەکانیشم تایەی سەیارە بیٚ، خۆ خوا عەقلیٚ داوە بە مرۆڤ سەیارەو تەیارەی پیٚ دروست کردووە، ئەبیٚ ئێمە هەموو گیانمان موسوڵمان بێت، ئێمە ئەزانین مەعنای تەوەجوهمان لەسەرەتای نوێژدا یەعنی چی ؟ کە ئەڵێین: ﴿وَجهتُ وَجهي للذي فَطَرَ السَموات وَالأرض حَنيفاً مُسلِماً وَما أنا مِنَ المُشرِكينْ .. قُل إنَ الصَلاةِ وَ نُسُكی وَ مَحيايَ وَ مَماتی للهِ رَبِ العلَمينْ﴾ .

یەعنی من گیانیشم بۆ خوایە، مردنیشم بۆ خوایە، لە بەینی ژیان و مردنیشا هەنگاو و هەڵوێست و نوسین و مردن و عیلم و سیاسەت و جامیعەو حیزبایەتی و ڕۆژنامەو هەمووی بۆ خوایە .

(مَحيايَ وَ مَماتي ) بۆ کیٚ ؟ بۆ (الله)، نەك بۆ (هواء)، نەك بۆ ﴿مَن اتَخَذَ إلَههُ هَواهُ﴾ . ئەبیٚ ئێمە ئەو وەعدە

جێبەجێ بکەین ، ئەزانی ئێمە چ بەڵێنێك ئەدەین بەخوا و بە ئەمانەتەكەی خوا كە قورئانە ؟

شاخەكان و زەوی و دەریاو زەریاكان نەیانتوانی هەڵی بگرن و تەحەمولی بکەن...

﴿وَأشفَقْنَ مِنها وَحَمَلَها الأنسان إنَهُ كانَ ظَلوماً جَهولاً﴾ .

تۆ هەموو ڕۆژێ ئەمە ئەڵێیتەوەو دوایش درۆ ئەكەی، موصیبەتی ئێمەی ئوممەتی ئیسلام لەمەدایە ، لەگەڵ هەموو موصیبەتەكانی تردا، سەری موصیبەتەكە لێرەوە دەست پێ ئەكات، بە دڵسۆزانە پێت ئەڵێم و حەز ئەكەم خۆت ڕاست بکەیتەوەو بەڕاستی داوای خێرو بەرەكەت بکەیت.

ئێمە جۆرێ ئیزدیواجیەتمان هەیە، یەعنی هەركەسێك لە ئێمە دوو شەخصە، بەلامانەوە دین یەعنی نوێژو ڕۆژوو حەج و زەكات و سوننەت و چەند فەڕزو چەند ڕەمەزان و لیلة القدر ئیتر دوای ئەوە یەكێ بەراز ئەخوات، یەكێ عەرەق ئەخوات، هەر بەچکە موسوڵمانەو ئەهلی نوێژەو ناوی (محمد)و (ئەحمەد)و (شریف)و (كریم)و (غفورە)و ئەمانە ڕۆڵەی موسوڵمانەو ئوممەتی (محمدە)ﷺ ، یەعنی خوای

قەبوڵە لە مزگەوتا بەڵام لە دەرەوەی مزگەوت خوایەکی تری هەیە، ئەچێت بۆ حیزبێکی تر، کە دروشمەکەی ناوی خوای تیا نییە، لێرە ﴿لاإلهَ إلا الله﴾ بەس کە چووە دەرەوە پەیوەندی ئەکات بە حیزبێکەوە کە ڕازی نییە بەخوا، ڕازی نییە بە ئیسلام، ڕازی نییە بە پێغەمبەرەکەت، ڕازی نییەو بڕوای نییە بە قیامەت، بەڵکو ڕازی نییە لە مێشکی تۆش دا هەبێت، لە خێزان دا لە ماڵ دا لە بازاڕ لە قوتابخانە لە جامیعە، کەچی ئەم کاکی نوێژ خوێنە ئامادەیە خوێنی ، عەرەقی ناوچەوانی، گیرفانی، منالّی بۆ تەرخان بکات و لە پێناویدا دڵی پێ ببەخشێت، گیانی پێ ببەخشێت، جوڵەو حەرەکەت و حوکمی بۆ ئەو بێ و ڕەزاو حوکمی بۆ ئەو بێت، ئەمە زۆر خەتەرە، ئەمە پێچەوانەی ﴿إنَ صَلاتي وَ نُسُكي وَ مَحيايَ وَ مَماتي للهِ رَبِ العلَمينْ﴾ە، لێرە هەموو شتێکی بۆ خوایە، تۆ چۆن خوات قبوڵە لە مزگەوتا ئەبێت قبوڵیشت بێت لە بازاڕدا، لە کڕین و فرۆشتن دا ، چۆن خوایەکی حەکیمەو نوێژو ڕۆژوو حەج و زەکاتی داناوە، ئاواش خوایەکی حەکیم و لێزانەو سیاسەتەکەی ڕەوایە، شەریعەتەکەشی جوانە، ئادابەکەشی پەسەندو شیرینە،

خوای گەورە لە هەمو شتێك دا خوایە، لە هەموو شتێك دا زانایە، دانایە، چۆن زانیبێتی بڵێت ئاوا دەست نوێژ بشۆن، چۆن ڕکوع و سجود بەری، بەڵام نەزانێ سیاسەت دابنێ ، شەریعەت و ئیقتیصادی بۆ دابنێ ، یا قانوونی بۆ دابنێ، یاساو دەستورت بۆ دابنێ، چۆن یاساو شەریعەتت بۆ دابنێ ، ئاواش حەکیمە لە ئیشەکانی تردا .

ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەر عاطیفەیەکی ڕووت نییە، هەر ئەو چەند دروشمە نییە، نوێژ و ڕۆژ و حەج و زەکات، وەکو وتم دەورەو تەدریسە، سەربازگەی ڕاهێنانەو مەشقی سەربازییە، بۆ ئەوەی لەو لێ بویتەوە، لە دەرەوە لە بازاڕ جێ بەجێی بکەی، لە ئیسلام دا سیاسەت لە دوای موسوڵمان بونەوەیە، ئەبێ ئیقتیصادت، خوێندنگەت، قوتابخانەت، جامیعەت، ڕادیۆت، تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەو گۆڤارو ڕاگەیاندنت موسوڵمان بن، با ئێمە بەیانی تا ئێوارە موسوڵمان بین، کە ئەوانە ڕوخاندیان ئیتر سوودی چییە، با مەلای داماو لە مینبەرەوە قوڕگی نوسا ئەوەندەی هاوار کردو ووتی: ﴿یاأیُها الذینَ آمَنوا﴾ .. ﴿یا أیُها الأنسانْ﴾ ... ﴿یا أیُها الناسْ﴾ .. بەڵام تەلەفزیۆن بە سەعاتێك

ئەیڕوخێنێت، ئێمە بە سەعاتێ بینای بکەین، ئەو بە دە دەقیقە ئەیڕوخێنێت، ئەو سیدی و ئەفلام و شتە پیسانە دێنە کونی ژورەوە، دێنە ژووری خەوتنەکەتەوە، لە دەرگا نادات پرست پێناکات، جەڕەست بۆ لێنادات، خۆی دێتە ژورەوە بە هەوادا، دێتە ژورەوە منالەکەت لە دەست ئەدات، ژنەکەت لەدەست ئەدات، شەیتانێك دێتە ناو مالەکەت، کە ئیتر لە شەیتان پیس تر نییە، شەیتانی دووپێ، شەیتانی ڕاگەیاندن، شەیتانی عەولەمە، شەیتانی سەقافەی ڕزیوو گەنیو، ژەهراوی لە دەرەوە هێنراوە، ئەم هەموو شتە پیسانە کە منالەکانمانی لەدەست دا، بۆیە بەزۆری منالەکانمان زایەع ئەکات، پارە سەرف ئەکەن ، بە مۆبایل خەلك هەراسان ئەکەن، لەبەر ئەوە ئەبێت ئێمە لە هەموو بوارێك دا موسولمان بین، ژیری پەسەندی ناکات تۆ نوێژت قبولْ بێ و عەرەق بخۆیتەوە، درۆکردنت بەلاوە شتێکی ئاسایی و زیرەکی بێت، بە تایبەتی سیاسییەکان کە درۆی شاخدارت بە تەن بۆ ئەکەن، نابێ ئاوا بێت، ئەبێ سیاسی درۆ نەکات بەرامبەر ، بە میللەت، بە نیشتمان، بەرامبەر بەخوا، سوکایەتی کردن و

برسی کردن  بە میللەت و بە سیاسەت و ژێری، ئەبێ هەموو میللەت بە کوڕو کچی خۆی بزانێت...

خۆشەویستەکانم:. ئەمە بە کورتی و پوختی مەعنای برێك لە﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ بوو، ئەبێ ئەوپەڕی زەلیلیمان هەبێت بۆ ئەوپەڕی خۆشەویستی، ئێمە هەزارو یەك خۆشەویستمان هەیە یەکێکیان خوایە، پەنجا خۆشەویستمان کۆکردووەتەوە یەکێکیان خوایە، ئاخر چەندی بۆ خوا ئەمێنێتەوە لەو خۆشەویستییە، لەناو ئەو هەمووەدا چۆن ئەبێت ئەو دڵە پەنجا خۆشەویستی تیا بێت، جار جار ئەڵێت یا الله .. یا علی .. یامهدی .. یا شێخ ... یا فلّان ... ئەو دڵەی شەیتانی تیابێت قەت خوای تێناچێت، هەر وەیژدانیەن ، خوا ئەفەرموێت: ﴿ما جَعَلَ اللهُ لِرَجُلٍ مِنْ قَلبَيْنِ فِي جَوفِهِ﴾ . خوا دوو دڵی بۆ هیچ کەس دروست نەکردووە، یەك دڵە ئەویش بۆ خوایە..

هەر دڵێ شیرك و کفری تیابێت، ناچێتە ناوی، ئەو عیبادەتەشی ناوێت، ئەو دین و تەقوایە نامێنێ، ئەبێ پاڵفتە کراو بێت، ئەم عیبادەت و نوێژو ڕۆژو زەکات و حەجە ڕوکنی دینە، ئەمە بەس بۆ پاکژکردن و بۆ خاوێن کردنەوەی

دڵ و عەقڵ و مێشك و مۆخ و هۆشە، كە بۆگەن نەكات، شەیتانی تیا نەمێنێت .

بەخوا خۆشەویستان: ئەگەر سەدساڵ عیبادەت بكەین، ئەگەر ئەمە نەزانین عیبادەتمان قەبوڵ نییە، دڵی هەركەسێك مسقاڵە زەڕڕەیەك شتی خراپ و خورافیات و شتی پڕوپوچ و داهێنراوی تیا بێت، خوای گەورە ناچێتە دڵیەوە، وە كەسێك كە بتوانێ سەرت بخات و ژێرت بخات و دەوڵەمەندت بكات، هەژارت بخات، تەنها خوایە، پێت وا نەبێت هێزێك هەبێت لەم گەردونەدا كە دەسەڵاتی لە خوا بەهێز تربێت ..

شاخەكان نەیانوێرا ئەم پەیامە هەڵبگرن..﴿وَاشْفَقْنَ مِنها وَحَمَلَها الأنسانْ إِنَهُ كانَ ضَلوماً جَهولاً﴾

نەگبەتی ئێمەی موسوڵمان و ئوممەتی ئیسلام ئەزانن لە چیدایە، خۆشەویستەكانم پشتی پێ ببەستی كە هەستای بڵێ ی یافلاَن كە دانیشتی (یا فلاَن)، نەگونجاوە ئەوە هەر جێگەی یا فلاَنی تیا ئەبێتەوە، ئەو دڵە ڕزیوەو جێگای خوای تیا نابێتەوە، خوا قەبوڵێ نییە كەس شەریكی بێت، خوا غیرەتی هەیە قەبوڵێ نییە هیچ عە بدێك ، ئەگەر مەلائیكەیە، ئەگەر مەلایە، ئەگەر شێخە، ئەگەر سەیدە، ئەگەر

دارو بەردە ، ئەگەر مانگ و ڕۆژە، خوا قەبوڵی نییە شەریکی ببیٚ، خۆی ئەفەرموێت: ﴿انا اغْنی الأغنیاءِ عَنِ الشركْ﴾ .

خوای گەورە ئەفەرموێت: من لە هەموو كەسێك بیٚ نیاز ترم، نە ژنم ئەوێت، نە كوڕم ئەوێت، نە وەزیفەم ئەوێت، ئەوە بۆ كەسێكە كە موحتاج بێت كە ئێوەن، ئێوە پێویستتان بەم شتانە هەیە، بەڵام خوا ﴿لَمْ یَتَخِذَ صاحِبَةً وَلا وَلَداً﴾ هەمووومان لەبەرمانە ﴿وَلَمْ یَكُن لَهُ كُفْواً اَحَدْ﴾ ....

تۆ هەر ڕۆژێك كە تەنگانەت بوو پەنا ئەبەیتە بەر ئەم و ئەو، یان لە كاتی تەنگانەدا خوات بیر ئەكەوێتەوە، فیرعەون لە كاتی تەنگانەدا ئیمانی هێنا، ئەبو جەهل و كافرەكان كاتیٚ گەیشتنە قڕیان، ووتیان: ﴿یاالله یاالله﴾ ئیمانی ناچاری نا، تۆ ئەبێت لەم مەركەز تەدریبەدا كە جومعەو جەماعەتە، ڕوو بكەیتە ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾.

كۆتایی دینم بە یەك ووشەی زۆر گرنگ، كە دەیان ئایەت و حەدیث تەئكیدی لەسەر ئەكەنەوە، كورت و پوختەكەی ئەوەیە، ئەگەر مرۆڤ گوناهی گەورەو بچووكی هەبێت، بەقەدەر كەفی دەریا، پێغەمبەری ئازیز ﷺ ئەفەرموێت: بەڵام تەوحیدی ﴿لا إلهَ إلا الله﴾ كەی ڕاست بێت، ڕزیو نەبێت،

ژەهراوی نەبێت، گەندەڵ نەبێت، بیدعەو شیركی تیا نەبێت، خوای گەورە ئەیخاتە بەهەشت، جا ئەو هەلە لە كیس خۆت مەدە، خوا گوناهی گەورەشی لا بچووكە بەس دڵەكەت پاك بێت . ﴿مَنْ خَشْيَ الرَحْمنُ بالغَيبُ وَجاءَ بِقَلبٍ مُنِيبْ﴾ . لە خوا بترسەو دڵت مەكە بە هێلانە بۆ غەیری خوا،﴿وَقُلِ للهَ ثُمَ ذَرهُمْ فِي خَوضٍ يَلْعَبونْ﴾

بڵێ: (الله)، كە نان ئەخۆی بڵێ (الله)، كە ئەكڕی بڵێ (الله)، كە ئەخەوی و كە هەڵئەستی، بڵێ (الله)، كە ئەچیتە دائیرەو بازاڕو لەماڵ دەرئەچیت، بەس بڵێ یا(الله)، ئەو دڵەت پڕ بكە لە الله ، ویژدانت پڕ بكە لە الله ، خەلییەكانت ، خوێنت ، دەمارەكانت، ئەو دەمە جوانەت، ئەو ناخە جوانەت پیس مەكە بە غەیری الله ، خۆت بچووك مەكەرەوە ، خۆت داماو مەكە، تۆ لە مەلائیكە گەورەتری ...

ئەو زمانە ، ئەو جەڕەس و حەنجەرە ، ئەو قەفەسەی سنگتە، ئەو مَنْشَأَ خواییە، ﴿فَأنشَأناهُ خَلْقاً آخَرْ .. فَتَبارَكَ اللهُ أحْسَنُ الخالِقِنْ﴾ .. بۆگەنی مەكە ، مەیڕزێنە ، ژەهری تێمەكە، ژەنگی تێمەكە، پیسی تێمەكە، شیرك و بیدعەی تێ مەكە، مرۆڤ زۆر گەورەیە خۆت بچووك مەكەرەوە، تۆ لە

شاخ و لە دەریاو لە مەلائیكە گەورە تری، پشت مەبەستە بە غەیری خواو مردو و شەخص ، تۆ ئەتوانی بجولێ ی ئەو مردووە، تۆ ئەخۆی ئەو مردووە، ئەو هیچ ناتوانی ، تۆ شت ئەتوانی، تۆ ئەتوانی دەست بەرز بكەیتەوە ئەو دەستی نەما تا بەرزی بكاتەوە، بەمە خۆمان لە گێلی ئەدەین، ئەو ئیشی بۆ خۆی كردووە، نالێ ی فلانە كەس چاكە ، ئەو چاكەی بۆ خۆی كردووە، تۆش برۆ بزانە ئەو بەچی بووە بەو پیاو چاكە، بزانە چی كردووە تا پیاو چاكی لێ دەرچووە، دووعای كردووە ، نوێژی كردووە، خێری كردووە، مزگەوتی دروست كردووە، ئەو شێخ و مەلاو سەیدانەی كە ئێمە بە دەوریانا ئەخولێینەوە، یەكێ داوای بەختی لێ ئەكات بەڵكو شوو بكات، ئەو بەڵكو ژن بهێنێت، ئەو بەڵكو كوڕی ببێت، ئەو بەڵكو چاكی بكاتەوە، ئەوە هەمووی لە خواوەیە، یەك دەرگا هەیە ، یەك كەس هەیە ناخەوێت ئەویش (الله) یە، یەك كەس هەیە دەرگای داناخرێ ئەویش (الله) یە، یەك كەس حەرەس وحیمایەی نییە، یەك كەس هەیە وەلامی هەموو كەسێك ئەداتەوە، یەك كەس هەیە گوێ لە هەموو كەس ئەگرێت، یەك كەس هەیە كە هەمومان نانەخۆرو عەبدو

میوانی سفرەی ئەوین، ئەویش (الله)یە، نەمەلائیکەن، نە پێغەمبەرانن، نە صالحانن، نە چاکانن، هەموو نان خۆرو هەژارو داماوی سەر سفرەی خواین، خۆت گێل وداماو مەکە، بڵێ ﴿لا إلهَ إلا الله﴾ ..

واز لە هەموو شتەکانی تر بێنە، ئەگەر گوناه وعەیب وعاریشت هەبێت، چۆن لێرە ئاشکرات ناکات، سوێن بەخوا لە قیامەتیشا فەزحت ناکات، چۆن لێرە ئەو هەموو عەیب وعارەت هەیە، کەچی پەنات ئەدات و بڵاوی ناکاتەوە بەناو خەڵکا، لە قیامەتیشا ئاوا سترت ئەکات و عەیبەکانت ئەشارێتەوە، لە قیامەتا خوا ئەچپێنێ بەگوێی عەبدەکەیەوەو ئەڵێت: بیرت دێت لە فڵانە شوێن چیت کرد ؟ عەبدەکەشی ئەڵێت : نەرەوەڵا یارەبی ، خوا ئەفەرموێت: ئەی باشە چیم لێ کردی ؟ ئەڵێ وەڵا حەیات نەبردم ، بەخوا ئەگەر حەیات ببردمایە ، ژنەکەم، منداڵەکانم، شەریکەکەم ، دراوسێکانم، هاوڕێکانم، قسەیان لەگەڵ نەئەکردم و دەریان ئەکردم، مەرحەباییان نەئەکردم و کاتێکیش کە ئەمردم نەیان ئەهێشت بمبەن بۆ مزگەوت و بمنێژن و کفن ودفنیان نەئەکردم، پاشان خوای گەورە ئەفەرموێت: ئێستە چی

بکەین باشە ؟ ئەڵێ خوایە گیان وەکو چۆن لە دنیادا حەیات نەبردم، ئێستەش حەیام مەبەو بمبەخشە، خوا ئەفەرموێت: دەی مادام لە دونیا حەیام نەبردی، لێرەش حەیات نابەم دەبڕۆ بۆ بەهەشت .!

ئەبێ مرۆڤ لەگەڵ خوا بێت، دیندارو موسوڵمان ئەمەیە کاکە ئیتر دوایی گوناهێکە عەیبێکە، نەزەرێکە، لەغوێکە، قسەیەکی هەڵیت و پەڵیتە، قسەو قسەڵۆکە، خوا لێت خۆش ئەبێت، بەخوا هەر خوا لێت خۆش ئەبێت، بەس ووتنی ﴿لا إلهَ إلا الله﴾ کەت، زەلیل مەکەو شتی تری تێکەڵ مەکە....

خوایە بۆ خاتری ناوە جوانەکانت ئیمانمان سەلامەت بکەی ...

دینمان سەلامەت بکەی و دڵمان پڕ لە خۆشەویستی خۆت بکەی ...

ئاخرمان خێرکەی، زەلیل وسەرشۆڕی دونیاو قیامەتمان نەکەی ...

آمين وَالحمدُ لله ربِّ العالمين ...

## ﴿وتاری.. باوەڕ بە ڕۆژی دوایی﴾

{بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ...الحَمْدُ للهِ رَبِ العالَمينْ وَالصَلاةُ وَالسَلامُ عَلى سَيِدنا وَإمامِنا محمدْ الصادقِ الأمينْ .. المَبعوثِ رَحْمَةً للعالَمينْ وَعَلى آلِه وَ صَحْبِهِ وَمَنْ دَعى بِدَعْوَتِه إلى يَومِ الدينْ وَالسَلامُ عَلَيكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ ...}

**خوشك و برا بەڕێزەكانم: سەلام و درودی خوای پەروەردگارتان پێشكەش بێت، ئێشتاش بە خزمەتی ئێوەی خۆشەویستی ئەگەینەوە، لە باسی بیرو باوەڕی موسوڵمانان، كە ئەویش باسێكی زۆر گرنگە سەبارەت بە ڕۆژی دوایی و باوەڕهێنان بەو ڕۆژە سەختە...**

**مانای باوەڕ بە ڕۆژی دوایی چییە ؟ بەكورتی پێویستە لەسەر هەموو مرۆڤێكی موسوڵمان بەوپەڕی هێزو تواناوە باوەڕێكی بەهێزو مەحكەم و قایمی هەبێت كە خوای گەورە هەركاتێك ویستی ئەم جیهانە ئەپێچێتەوەو لەناوی ئەبات، وە ئەو سیستەم و جوانی وڕێك و پێكی و تەباییەی كە هەیە لە بونەوەردا، هەمووی تێك ئەدات بەسەر یەكداو ئەو شكڵەی كە ئێستا هەیە لە دەریاو لە ئاسمان و لە زەریاو لە**

كێوەكان و لە تەڕایی و لە وشكانی و لەبەرزی و لە نزمی، ئەم سیستەمە هەمووی لەناو ئەبات و جیهانێكی تر ئەهێنێتە جێگای، كە پێی ئەوترێ ڕۆژی دوایی.

وە جیهانی داهاتوو كە جیهانی حەقیقەتە، وە ئەم جیهانە پێشەكییە بۆ جیهانەكەی ترو بەرپا بوونی، لەوێدا هەموو حەق وحیسابێك كە هەبێت لەگەڵ بەندەكان ئەكرێ و هەموو كەس نامەی خۆی وەرئەگرێ و دەر ئەكەوێت كێ لە تاقیكردنەوەی ئەم جیهانە سەركەوت و (ناجح) بووە وەكێ نمرەكانی سفرەو دەستمایەی نییە، ئینجا باوەڕ بە ڕۆژی دوایی واتە: باوەڕ بە مردن و ئەو شتانەی كە لە دوای مردن ڕوو ئەدەن، وەكو پرسیاری ناوگۆڕو خۆشی و ناخۆشی ناو گۆڕو زیندوو بونەوەی ڕۆژی دوایی و كیتاب وحیساب و كێشانەكردنی كردارەكانمان ، وە حەوزی كەوسەرو پردی صیراط و شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ و پێغەمبەرانی ترو شوهەداو صالحین و فریشتەكان .. وە كۆتاییەكەی دێت بە بەهەشت و دۆزەخ ، وە ئەو شتانەی تر كە لە دوایدا بۆتان باس ئەكەین (إنشاءَ الله ) ...

باوەڕ بە ڕۆژی دوایی یەعنی ئەم شتانە لە مردنەوە تا بەرەو بەهەشت یان بەرەو دۆزەخ چوون (خواپەنامان بدات لە دۆزەخ )...

گرنگی باوەڕ بە ڕۆژی دوایی كە بەڕاستی كاتێك كە ئێمە قورئانی پیرۆز ئەخوێنینەوە ، ئەبینین قورئانی پیرۆز زۆر بایەخ و گرنگی ئەدات بەم ڕۆژە، وە بەو ڕووداوانەو ئەو پێشهاتانەی كە ڕوو ئەدەن تێیدا، وە ئەبێت مرۆڤی موسوڵمانیش هەمان گرنگی و هەمان ئاوڕدانەوە بدات بە ڕۆژی دوایی و بەو ڕووداوە سەختانەی كە تیایەتی .

قورئانی پیرۆز لە هەموو بۆنەو باسێك دا باسی قیامەتی كردووە، كاتێك باسی باوەڕ بەخوا ئەكات، باسی قیامەتیش ئەكات، كاتێك باسی ئەركەكانی تری ئیمان ئەكات هەر باسی قیامەت ئەكات، كاتێ باسی ئەحكامی شەرعی، سیاسی ، فەرهەنگی، ئابووری ، خێزانی ، كۆمەڵایەتی، لە هەموو ئەو بوارو باسانەدا، كاتێ باسی بەسەرهاتی كافران و چاكان و خراپان و ڕابردووەكانیان ئەكات، باسی قیامەتیش ئەكات، باس لە هەر بۆنەو موناسەبەیەك بكات، پەیوەستی ئەكات بە قیامەت و قەزیەی قیامەتەوە، بە دەیان شێوەو شێواز خوای

گەورە مرۆڤ ئاگادار ئەكاتەوە لە هاتنی ڕۆژی دوایی و نەمانی ئەم دونیاو ژیانە ئەستەمە، وەیەكێك لە شێوازەكانی قورئانی پیرۆز كە كەلامی خوایە ئەوەیە كە هەركاتێك باسی باوەڕ بە خوا بكات، یەكسەر باسی باوەڕ بە ڕۆژی دوایش ئەكات، بەڵام شەرت نییە هەموو كاتێك كە باسی باوەڕ بە خوا بكات و باسی كتێبەكانی تر بكات و باسی ئاخیرەت بكات، یان باوەڕ بە پێغەمبەرەكان، یان باوەڕ بە فریشتەكان، بەڵام ڕێك ناكەوێت خوای گەورە باسی ئیمان بە (الله) بكات، ئیللا باسی ئیمان بەڕۆژی دوایشی لەگەڵ ئەكات..

بۆ نموونە : خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئەفەرموێت: ﴿وَلَكِنَ البِرَ مَنْ آمَنَ باللهِ وَاليَومِ الأخَرْ﴾ لە ئایەتێكی تردا ئەفەرموێت: ﴿مَنْ آمَنَ باللهِ وَاليَومِ الأخَرْ وَعَمَلَ صالِحاً﴾ ..

واتە : لە هەر جێگایەكا خوای گەورە كە باسی باوەڕ بە (الله) ئەكات، باسی باوەڕ بە ڕۆژی قیامەتیش ئەكات، چونكە باوەڕ بە ڕۆژی قیامەت وەختێ دائەمەزرێت كە باوەڕت بە (الله) ببێت، وە باوەڕ بە (الله) كاتێك دروستەو دامەزراوە كە باوەڕت بە ڕۆژی دوایی هەبێت، وە گەورەیی و حیكمەت و دەسەڵات و عەظەمەتی خواو باوەڕ بە خواش لە ڕۆژی دوایدا

بە تەواوەتی دەرئەکەوێت، یان لە هەندێك شوێنی تردا بەم شێوەیە ڕەبتی ئەکات لە بەینی باوەڕ بە قیامەت لەگەڵ باوەڕ بە (اللّٰه)، وەك ئەفەرموێت: ﴿قاتِلوا الذينَ لا يُؤمِنُونَ باللّهِ وَاليَومِ الأخَرْ﴾ ...

کەوابێ بە کورتی بڵێین: لە هەموو باس وخواستێکدا، لە هەموو لاپەڕەیەکدا لە لاپەڕە پیرۆزەکانی قورئان دا، باسی قیامەت و ڕۆژی دوایی هەیە بە شێوەیەك لە شێوەکان .

هەروەها یەکێکی تر لە گرنگییەکانی قورئانی پیرۆز بەو ڕۆژە سەختەو پێشهاتە سەختەکانی ئەوەیە کە دەیان ناوی لێناوە : (يَوم الأخَرْ) .. ڕۆژی دوایی، بەیەك ناو نییە لە هەموو شوێنەکان داو لە هەموو بۆنەو موناسەبەکان دا، یەك ناوی هێنابێ، بەڵکو لە قورئانی پیرۆزدا دەیان ناو نراوە لە ڕۆژی دوایی، کە هەر ناوێك سەبارەت بە ڕووداوێکە کە ڕوو ئەدات تیایدا...

ناوی (الحاقّة) .. چونکە زۆر ڕاستە، (القارعة) .. چونکە مرۆڤ ڕائەچڵەکێنێ، (الطّامة) .. چونکە موصیبەتێکی زۆر گەورەیە، (الصّاخة) .. چونکە ئەشریخێنێ بەسەر مرۆڤ دا، (يَومُ الدينْ) .. چونکە پاداشت و تۆڵە لەوێ وەرئەگرێتەوە،

(يَومُ الجَمعْ) ... چونكە هەموو دروستكراوەكان ئەو ڕۆژە كۆئەبنەوە، (الغاشِية) .. چونكە هەموو دونيا دائەپۆشىٚ ، هەموو گيانلەبەران ئەگرێتەوەو دايان ئەپۆشێت، (يَومُ الحَسْرة) ... (يَومُ الفَزَعُ الأكبَر)... وَهكذا .

قورئانى پيرۆز بە دەيان ناوى لەم ڕۆژى دواييە ناوە، هەر ناوێكيش ئاماژەيە بۆ حاڵەتێك و بۆ تايبەتمەندييەك ، يان بۆ ڕووداوێك كە لە ڕۆژى دوايدا ڕوو ئەدات، كە ئەوە ئاگادار كردنەوەى ئێمەى مرۆڤە كە ئەبێت خۆمان ئامادە بكەين بۆ ئەو ڕۆژە سەختە، كارێك بكەين بە ڕوو سورى و بە دڵى خۆشەوە ئاڕاستەى ئەو ڕۆژە ببين و مواجەهەى ئەو ڕۆژە بكەين .

هەروەها قورئانى پيرۆز بۆمان تأكيد ئەكاتەوە كە هەموو پێغەمبەران و هەموو كتێبەكان دووپاتيان كردووەتەوەو جەختيان كردووەتەوە لەسەر گرنگى ڕۆژى قيامەت و هاتنى ڕۆژى دوايى ، وە ئەبێت ئوممەتەكەيان باوەڕى تۆكمەيان هەبێت و ببێت بەو ڕۆژە سەختەو بەو ڕووداوانەى كە لەو ڕۆژەدا ڕوو ئەدەن، ئەمەش شێوازێكى ترە لە شێوازەكانى قورئانى پيرۆز ..

قورئانی پیرۆز کە موسوڵمانان هان ئەدات و هەڵیان ئەنێت بۆ باوەڕ هێنان بەڕۆژی دوایی، وە خۆ ئامادە کردن بۆ مواجەهەو ڕوو بەڕوو بونەوەی ئەو ڕۆژە.

لەوانەیە لێرەدا بپرسین بۆچی قورئانی پیرۆز و پێغەمبەرەکان و کتێبە ئاسمانییەکان زۆر گرنگییان داوە بە ڕۆژی دوایی ؟ دیارە لەبەر ئەوەی باوەڕ بە ڕۆژی دوایی زۆر کاریگەرەو زۆر ئاکامی هەیە لەسەر ژیانی مرۆڤ و ڕەوشت و ئاداب و خلوقی و دڵی و فکرو هۆش و بیرو ڕۆحی ..

وە جیاوازی زۆرە لە نێوان دوو کەسدا کە یەکێکیان باوەڕی بە ڕۆژی دوایی هەبێت و خۆی بۆ ئامادە بکات لە گەڵ کەسێکی تردا کە خۆی ئامادە نەکات و بڕوای بەو ڕۆژە نەبێت، حەتمەن ئەو کەسەی کە باوەڕی بە ڕۆژی دوایی هەیە، هەمیشە خۆی خەریک ئەکات بە شتی چاکەوە، وە دونیا بە وێستگەیەك ئەزانێ بۆ گەیاندنی بە ڕۆژی دوایی، وە بە تاقیکردنەوەی دائەنێت، بە هەموو شتێکی دانانێت، وە خۆی دوور ئەگرێت لە شتی قەدەغە کراو، لە شکاندنی سنورەکانی خوا، وە ئەو سنورانە نابەزێنێ و خۆی خەریك ناکات بە گوناه و تاوان و سەرپێچی لە فەرمانی خوا، بەڵام

کەسێکی تر کە باوەڕی بەو ڕۆژە نییە، بێگومان ژیان بەلای ئەوەوە بە تەنها دونیایە، لەبەر ئەوە هەموو تاوان و گوناه و خراپەیەك ئەکات و هەموو کرارێکی خراپی لێ ئەوەشێتەوە، بەڵام مرۆڤی موسوڵمان کە باوەڕی تەواوی بە ڕۆژی دوایی هەیە، هەمیشە چاوی لەو شتانەیەو لەو ئاکام و کردەوانەیە کە بۆ ڕۆژی قیامەتی باشە، بۆ ژیانی ڕاستەقینەی باشە کە ژیانی قیامەتە، بەڵام ئەوی تر کە باوەڕی بە ڕۆژی دوایی نییە ، زۆر سروشتییە کە ببێتە بەندەیەك بۆ هەواو ئارەزوو ، شەیتان چی پیێ ئەڵێت ئەو بە گوێی ئەکات، وە لە قسەی شەیتان دەرناچێت، وە هەرگیز نزیکی خێرو چاکە ناکەوێت...

جا با بزانین پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە هەموو کەسێك زیاتر خۆی حازرو ئامادە کردبوو بۆ ئەو ڕۆژی دواییەو وە ئەم پەیامەی بەیانی و ئێوارە ئەگەیاند بە صەحابەکان، بزانین صەحابەکانی چۆن ڕاهێنابوو ، چۆن پەروەردەی کردبوون، چۆن دروستی کردبوون و بنیادی نابوون لەسەر باوەڕ بە ڕۆژی دوایی، وە هەڵوێستی ئەو صەحابانە چۆن بوو، ئەوەی کە سیرەتی پێغەمبەرﷺ و یارو یاوەرە

بەڕێزەکانی بخوێنێتەوە ڕەحمەت و ڕەزای خوایان لەسەر بێت، ئەزانیٚ ئەوانە پیاوی دونیا نەبوون ، بەڵکو پیاوی ئاخیرەت بوون.

وە هەمیشە چاویان لە قیامەت بوو، وە کارێکیان ئەکردو کردارێکیان ئەکردو هەنگاوێکیان ئەنا، هەڵوێستێکیان ئەگرتە پێش، کە بۆ قیامەتیان باش بێت، کە ببێتە مایەی ڕوو سوری و سەر بەرزییان لەلای خوا، ئەتوانین بڵێین هەرچەند پێیان لەسەر زەوی بوو، بەڵام بیریان لای قیامەت بوو، هەرچەند بە لەش لە ژیانی سەر زەویدا بوون و بە ژینگەی دنیادا ئەگەڕان، بەڵام بەهۆش و بیرو ئاوات وحەزیان، بە غەمم و هەمیان هەمیشە لە قیامەت بوون، وە کارێکیان ئەکرد کە بۆ قیامەت بشێت، جیلی صەحابە جیلێکی قورئانی بووە، وە جیلێکی ئوخرەوی بووە، بڕوا ناکەم لە مێژووی ئەم مرۆڤایەتییەدا، لە خەڵکی ئەم سەرزەوییەدا مرۆڤێکی تر بوبێت کە بەقەدەر صەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕەببانی و ئوخرەوی بوبیٚ، لەبەر ئەوە مێژوویان سەراپا فەضڵ و مەجدو شەهامەت و جیهادو تێکۆشان و پەروەردەو فەتحی دڵ و دونیای خەڵکە، لەبەر

ئەوە كە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی هەبوو، لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ یەكێك لە وەسیلەی تەربیەی ئەو جیلە قورئانییە، پەروەردەی ئەو صەحابانە بوو لەسەر باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی، بۆیە نەئەترسان، پاشا كشەیان نەئەكرد، باوەشیان نەئەكرد بە دونیادا، هەمووی لە غەریبیدا شەهید بوون، هەمیشە هەر پیاوێكیان بەرامبەر بە هەزار پیاو بووە، وە جێدەستیان لە هەموو بوارێكی شارستانی و ژیانیان دا دیارە، چونكە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی و قیامەت هەبوو، وە ئەو ئایەتانەی كە لە قورئان دا هاتونەتە خوارەوەو باسی ڕۆژی قیامەت ئەكەن، یەكەم كەس ئەوان گوێیان لێگرت، وە بەدڵ وەریان گرت و كاریان پێكرد، وە بوو بوون بە موجەسەمەی ئەو ئایەتەو ئەو پەروەردانە، بۆیە صەحابەكان زۆر گرنگییان دابوو بەو بوارە ....

بۆیە ئەبێ ئێمەش ئەوان بكەین بە پێشەواو سەرمەشق وچاوساغی خۆمان و وەكو ئەوان گرنگی بدەین بەڕۆژی دوایی و خۆمانی بۆ ئامادە بكەین و كاری بۆ بكەین و وە هەر شتێك بۆ قیامەت باش بوو، ئەوە بكەین بە دەستمایەو سەرمایە ....

# ﴿باوەڕ بە قیامەت﴾

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ... الحَمْدُ للهِ رَبِ العالَمينْ وَالصَلاةُ وَالسَلامُ عَلى سَيدينا محمدٍ إمامِ المُتقينْ وَعلى آلِهِ وَصَحبِهِ وَمَنْ دَعى بِدَعوَتِهِ إلى يَومِ الدينْ ... وَالسَامُ عَلَيكُمْ وَرَحمةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ ..

**خوشك و برا بەڕێزەكان سەلام و ڕەحمەتی خوای پەروەردگارتان لێبێت، ئێستاش جارێكی تر بەیەك ئەگەینەوە بۆ ئەوەی باسی ڕوكنی باوەڕ بە ڕۆژی دوایی درێژە پیٚ بدەین ، ئەوە بوو لە دەرسی پێشوومان دا باسمان كرد كە قورئانی پیرۆز چۆن جیاوازی كردووە لە بەینی كەسێك دا كە باوەڕی بە ڕۆژی دوایی هەیەو كەسێك كە باوەڕی پێی نییە، وە ڕونمان كردەوە كە چۆن صەحابەكان پایەدارو پەیام دار بوون بە مەعنای باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی، وە ئەو باوەڕە هانی ئەدان بۆ كردنی هەموو چاكەیەك و دوورە پەرێزی لە هەموو گوناه و خراپەیەك، هەروەها قورئانی پیرۆز یەكێكی تر لە شێوازەكانی كە باسی قیامەتمان بۆ ئەكات و باسی قیامەتمان تیٚ ئەگەیەنێت، ئەوەیە كە هەرچی چاكەیەك كە مرۆڤ ئەیكات هەر خێرێك كە**

مرۆڤ پێی هەڵئەستێت بناغەی ئەگەڕێتەوە بۆ باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی ، وە هەر شارستانیەتێك و هەر نەوەو هەر كەس و میللەتێك كە سەرپێچی ئەكەن و سەركەشی ئەكەن لە ڕێگەی ڕاست لائەدەن و ستەم ئەكەن و فەساد لەسەر زەویدا بڵاو ئەكەنەوە، هەمووی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە ئەو كەس ولایەن وشارستانیەت و كۆمەڵگایانە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نییە، ئەوە هەر لەو سوڕەتانەوە كە لە سەرەتای قورئانەوە هاتونەتە خوارەوە ، خوای گەورە ئەفەرموێت:﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۞ أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ۞ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ۞ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ﴾ ... هەرچی خراپەیە وەكو پشت كردنە هەتیوو، وەكو دەست گرتنەوەو دەست نوقاندن و یارمەتی نەدانی هەژارو داماو، هەمووی پەیوەندی بەوەوە هەیە، چونكە (يَكَذِبُ بِيَومِ الدينْ)، ئەو كەسەیە كە باوەڕی بە ڕۆژی دوایی نییە ....

یان باسی فیرعه‌ون و ده‌سته‌و دائیره‌كه‌ی ئه‌كات كه‌ چه‌ند تاوان وفه‌سادیان له‌سه‌ر زه‌وی بڵاوكرده‌وه‌، چۆن ئه‌یانویست نووری خوا بكوژێننه‌وه‌، چۆن نه‌وه‌ی به‌نی ئیسرائیلیان ئه‌چه‌وسانده‌وه‌و له‌ناویان ئه‌بردن، وه‌ ئه‌فه‌رموێت: ﴿وَظَنوا أَنَهُم الَينا لا يَرجِعونْ﴾ بۆیه‌ ئه‌و خراپانه‌یان ئه‌كرد فیرعه‌ون و ده‌سته‌و دائیره‌كه‌ی، چونكه‌ باوه‌ڕیان نه‌بوو به‌ زیندووبونه‌وه‌و گه‌ڕانه‌وه‌ بۆ لای خوا، بۆ دادگایی خوا، هه‌روه‌ها باس ئه‌كات خه‌ڵكانێكی تر چاكه‌ ئه‌كه‌ن و مزگه‌وت ئه‌كه‌نه‌وه‌، ئه‌وه‌ له‌به‌ر ئه‌وه‌یه‌ و بۆیه‌ خێرو چاكه‌ ئه‌كه‌ن ، چونكه‌ باوه‌ڕیان به‌ ڕۆژی دوایی هه‌یه‌ ، وه‌ باوه‌ڕیان به‌ خوای تاك و ته‌نها هه‌یه‌ كه‌ الله‌ یه‌، ﴿إنَما يَعْمِرُ مَساجِدَ اللهِ مَنْ أمَنْ باللهِ وَاليَومِ الأخَرْ﴾ ..

وه‌ له‌ ئایه‌تێكی تردا ئه‌فه‌رموێت: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا

ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ ..

كەوابێ هەر چاكەیەك كە مرۆڤ ئەیكات ، ئەوەی كە پاڵی پێوە ئەنێت كە بیكات باوەڕە بە ڕۆژی دوایی، وە ئیمانە بە خوا (سبحانَهُ وَتَعالی) ، وە ئیمانە بە ئەركەكانی ئیمان ...

بەڵام هەركەسێك خراپە ئەكات ئیللا هۆكەی ئەوەیە كە چاوەڕوانی زیندوبونەوەو پێشهاتەكانی ڕۆژی دوایی ناكات، بۆیە ئیزن ئەدات بە هەواو بە نەفسی ئەممارەی كە هەموو خراپەكان ئەكات و نزیكی چاكە ناكەوێت .

كەوابێ هەر بەسە بۆ گرنگی ڕۆژی دوایی و باوەڕ بە ڕۆژی دوایی ، كە ڕۆژی دوایی مرۆڤ هان ئەدات بۆ وازهێنان لە خراپەو ئەنجامدانی هەموو واجباتەكانی چاكە، وە باوەڕ نەبوون بە ڕۆژی دوایی كە مرۆڤ ڕائەكاو بەرەڵای ئەكات، دوور بێت لە هەموو چاكەیەك و نزیك بێت لە هەموو خراپەو تاوانێك ...

وە قورئانی پیرۆز ئاوا پێناسەی ڕۆژی دوایی ئەكات ، وە هەموو خێرەكان پەیوەست ئەكات بەڕۆژی دواییەوە، وە

هەموو تاوان و خراپەکانیش کە کراوەو ئەکرێ، هەموو پەیوەست ئەکات بەوەی کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نییە، ئایەت و سورەت زۆرەو قورئانی پیرۆز پڕیەتی لەم ڕاستیانە، ئەو چەند نموونەیەی کە ووتمان (إنشاءَ الله ) بەسە .

قورئانی پیرۆز بەڵگەی زۆریشی هێناوەتەوە بۆ چەسپاندن و هاتنی ڕۆژی دوایی، بە دەیان شێوەو شێواز نمونەی بۆ هێناوەتەوە، بە دەیان جۆری دەربڕین، یەکێك لەوانە خوای پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْيِ ٱلْعِظَـٰمَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَـٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّـٰقُ ٱلْعَلِيمُ﴾ ...

ئەمە نموونەیەکە لەو ئایەتانەی کە بەڵگەن لەسەر هاتنی ڕۆژی دوایی و نەمانی ئەم ژیانەو ئەم جیهانە، کافرەکان

پرسیار ئەکەن چۆن ئێمە زیندوو ئەبینەوە ؟ ئینکارییان ئەکرد کە خوا بتوانێ زیندویان بکاتەوە، وایان ئەزانی خێرو دەسەڵات و قووەتی خوای گەورەش وەکو ئێمە کەمەو کۆتایەو سنوردارە، خوای گەورەش فەرمووی: ئەی نەتان بینیوە، وە ئایا کەسێك هاتووە کە ئێوەی لە نەبون دروست کردبێت، ناتوانێ جارێکی تر دروستتان بکاتەوە لە بوون ؟ کە ئەمەی ئاسانترە لەوەی کە لە ئەصڵا هەر لە نەبوون و لە هیچ ئێوەی دروست کردووە، ئێستە بناغەیەك هەیە کە جارێکی تر ئێوەی لێ دروست بکاتەوە، ئەوجا چەند نموونەیەك دێنێتەوە بۆ ئەو شتانەی لەبەر دەستمانا هەیە وەکو دارو درەخت و ئەرزو ئاسمان و ئەوەی کە بەکاری دێنین ، کەسێ کە بتوانێ ئەو زەوی و ئاسمان و کێوو شاخ و دارو درەختانە ، ئەو هەموو بەرەکەتەی کە ڕشتوویەتی بەسەرتانا، بتوانێ هەموو ئەوانە لە هیچ بێنێتە بوون، ئایا ناتوانێت جارێکی تر دروستیان بکاتەوە، وە ئایا مەعقولە ئەو هەموو شتە بەدەست بهێنێت، وە موحاسەبەشتان نەکات، تا بزانێ کێ باش بەکاری هێناوەو کێ مافی ئەم ژیان و ژینگەیەی داوەو کێی تر نەیداوە، حاشاللە...

﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَما خَلَقْناكُمْ عَبَثاً وَأَنَكُمْ إِلَيْنا لا ترجُونَ فَتَعالَى اللهُ المَلكُ الحَقِ لا إِلَهَ إلا هُوَ رَبُ العَرْشِ الكَرِيمْ﴾ ...

مەعقولە خەڵكینە، ئەچێت بە هۆشی مرۆڤێکی ژیرو بە بیردا ؟ کە ئێوە دروست بکات و لێشتان نەپرسێتەوە ، چۆن ئەڕۆن ؟ چۆن ئەکەن ؟چی ئەکەن ؟ چی ئەڵێن ؟ سلوك و بەرنامەی ژیانتان چۆنە ؟ حاشا شتی وا پێچەوانەی ئیمانە بەخوا، پێچەوانەی گەورەیی و کاربەجێی خوایە .

کەوابێ باوەڕ بە قیامەت تەئکیدە لەسەر باوەڕ بە (الله)، کەسێك بڵێت قیامەت نییە یەعنی ئیشی بێجێیە ، کەوابێ باوەڕەکەشی بەخوا دانەمەزراوە، باوەڕەکەشی بەخوا باوەڕێکی ڕێك و دروست و شەرعی نییە، ئینجا ئەفەرموێت: ﴿أَيَحْسَبُ الأنسانُ أنْ يَتْرُكَ سُداً﴾ . ئایا مرۆڤ وا ئەزانێت هەروا وازی لێ ئەهێنرێت کە بە ئارەزووی خۆی بخوات و بچێ و کەسیش لێی نەپرسێتەوە، حاشالله ..

﴿أَلَمْ يَكُنْ نُطْفَةً مِنْ مَنِي يُمنى .. ثُمَ كانَ عَلَقَةً فَخَلق فَسَوى .. أَلَيْسَ ذلِكَ بِقادِرٍ عَلأى أنْ يُحِيِ المَوتى﴾ .. بَلى انه عَلى كُلِ شَيء قدير ..

بەم شێوە دڵفڕێنە سەرنج ڕاكێشە هەموو كەسێك ئەندازەی چەند نزم بێت، یان چەند بەرز بێت، وەكو یەك پێی ئەگاو وەكو یەك ئەهەژێ و ئەكەوێتە جوڵە و تەكان ...

بەدەیان شێوەی تر قورئانی پیرۆز بەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر ئەوە كە ئەم دونیایە ئەپێچرێتەوەو نامێنێت، وە جیهانێكی ترو وەزعێكی تر دێتە پێشەوە كە ڕۆژی دواییە، ڕۆژی حیساب وكیتابە، وە ڕۆژی ئەو موفرەداتە گرنگانەیە كە ڕوو ئەدەن، جا با بزانین ڕۆژی قیامەت چی ڕوو ئەدات و چۆن دەست پێ ئەكات و لە كوێوە كۆتایی دێت، وە وتمان ڕۆژی قیامەت باوەڕ بوونە بە چەند ڕووداوێك ، بابزانین ئەو ڕووداوانە چین یەك لە دوای یەك ..

یەكەم ڕووداو دوای مردن طەبعەن كە یەكەم هەنگاوی ئاخیرەت مردنەو قەبرەكەیە، وە دوا مەنزڵێ مرۆڤیش لە دونیایا هەر قەبرە، دوای ئەوە یەكسەر یەكەم ڕووداو كە لە هەمووی سەختترو گرنگترەو دەست پێ ئەكات، بەڕاستی فیتنەی گۆڕە، یەعنی لێپرسینەوەو پرسیار كردن و وەڵام دانەوەی ناو گۆڕ ، وە لەو بارەوە چەند فەرموودەی صەحیحمان هەیە هەر كەسێك مرد، جا بسوتێ لە شاخا، لە

بنی بەحردا بێت، لە ئاسمان بێت، لە مەریخ بێت، کە ئەمرێت ، بەزۆری کە ئەچینە ناو گۆڕو قەبر، فیتنەی ناو گۆڕ لێپرسینەوەی ناو قەبر، ئەگینا ئەگەر نەشخرێتە ناو قەبر هەر ئەو پرسیارو لێپرسینەوەیەی لیٚ ئەکرێت، لە هەر کوێیەك بێت، وە یەکەم شت کە پرسیاری لیٚ ئەکرێت دەربارەی خوا، دەربارەی باوەڕ بە پێغەمبەر ، دەربارەی باوەڕ بە پێغەمبەران، دەربارەی باوەڕ بە ئەرکەکانی ئیمان، یەکەم شت کە مرۆڤ إمتحان ئەکرێت، ئەگەر لەویٚ سەرکەوت و ناجح بوو دیارە شتەکانی تریش ئاسانە، بۆیە صەحابەکان وەکو ئیمامی عوسمان و ئەوانی تر ڕەزای خوایان لێبێت، زۆر گرنگییان ئەدا بە قەزیەی ناوگۆڕو پرسیاری ناوگۆڕ، وە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فێری کردوین لە دوای تەشەهودو پێش سەلام دانەوەی نوێژەکانمان دوعا بخوێنین و بپاڕێینەوە کە خوای گەورە سەرکەوتومان بکات لە فیتنەی قەبرو ڕزگارمان بکات و لەو تاقیکردنەوەیەدا سەرکەوتومان بکات، یەکەم ڕووداو و یەکەم هەنگاوی قیامەت بە پرسیاری ناو گۆڕ دەست پێئەکات،

پرسیارەکانیش دەربارەی خواو پێغەمبەرو ئەرکەکانی تری ئیمان ..

دووەم : خۆشی ناو گۆڕەکەیە، یان خوانەخواستە ئازارو سزادانی ناو گۆڕە، کە ئەویش بە ڕیزبەندی و بەم شێوەیە دێت :

دوای پرسیارەکان ئەگەر مردووەکە جا پیاو بێت یان ژن سەرکەوتو بوو پرسیارەکەی بە ڕێك و پێکی جواب دایەوەو ووتی: اللهُ رَبي .. محمدٌ نَبي .. وكَعْبَةُ قِبْلَتي ... تا دوایی، ئەوە لە خۆشییەکدا ئەبێت کە پێشەکییە بۆ بەهەشتی بەرین، ئیتر ئێش و تۆف و غەم و ئازاری لەسەر لا ئەچێت، وە گۆڕەکەی بۆ ئەبێتە باخچەیەك لە باخچەکانی بەهەشت ..

ئەگەر خوانەخواستە لە گۆڕەکەشدا سەرکەوتو نەبوو نەیتوانی وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە، واتە لە دونیادا ئەو پرسیارانەی وەڵام نەدابویەوەو بە گوێرەی شەرعی خوا ڕەفتاری نەکردبوو، بێگومان لەوێ لاڵ ئەبێ و ناتوانێت درۆبکات و ناتوانێت پرسیارکەرەکان و مەلائیکەتەکان بخەڵەتێنێت، ئەوە هەر لەوێ دەست ئەکرێ بەلێدان و

ئازاردان و سزادانی تا ئەو ڕۆژەی كە زیندوو ئەكرێتەوەو ڕووداوەكانی قیامەت دروست ئەبن ..

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ﴿القَبْرُ إما رَوضةٌ مِنْ رِياضِ الجَنةِ أو حفْرةٌ مِنْ حُفُرِ النارْ﴾ .

حەدیثمان دەربارەی قەبرو عەزابی قەبر زۆر زۆرە خوا پەنامان بدات، كە ئەو كەسە ئیتر قەبرەكەی بۆ ئەبێتە بەشێك لە دۆزەخ و هەر لەو ساتەوە لەناو دۆزەخ دا ئەژی تا ئەو كاتەی كە قیامەت دادێت، ئینجا ڕێگەی خۆی بەرەو دۆزەخ ئەبرێت، خوا پەنامان بدات و لە عەزابی قەبرو قیامەت بمان پارێزێت و ڕزگارمان بكات ..

سێهەم ڕووداو كە ڕوو ئەدات دوای لێپرسینەوەو خۆشی یان ناخۆشی گۆڕ، لە ڕووداوەكانی ئاخر زەمانە، كە پێی ئەوترێ نیشانەكانی نزیك بونەوەو هاتنی ڕۆژی دوایی، جا ئەوانەش كۆمەڵێك ڕووداوی زۆرن، عولەما دابەشیان كردوون بەسەر دوو جۆردا، ڕووداوەكان و نیشانەكانی ڕۆژی دوایی دوو بەشن پێیان ئەوترێت : نیشانە بچووكەكان و نیشانە گەورەكان ، كە لێرەدا جێگە نییە هەموویان باس بكەین، بەڵام نیشانە بچووكەكان بریتین لەوەی كەوا عیلم و زانست

نامێنیٚ و جەهل ونەزانی بڵاو ئەبێتەوە، زینا زۆر ئەبیٚ و عەرەق ئەخورێتەوەو ئافرەت زۆر ئەبیٚ، بەهۆی شەڕو فیتنەو فەسادەوە پیاو کەم ئەبێتەوە، تا وای لێدێت بەرامبەر یەك پیاو پەنجا ژن ئەبن، وە هەتتا ناردنی پێغەمبەری خۆمان ﷺ یەکێکی ترە لە نیشانەکانی ئاخر زەمان، لە نیشانە بچووکەکانی ئاخر زەمان، شەڕوشۆڕو فیتنەو فەساد زۆر ئەبێت، بیٚ ڕەحمی زۆر ئەبێت، ڕۆژگار لەیەك نزیك ئەبێتەوە، پێشکەوتنێکی ماددی یەك لایەنە دروست ئەبێت، دواکەوتنێکی مرۆیی و ئەخلاقی و دینی دروست ئەبێت ...

ئەوانە بە گشتی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی بوون ، کە پێیان ئەوترێت نیشانە بچووکەکان کە لە ژمارە نایەن چونکە زۆرن، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر باسی کردوون و بە تایبەتی لە کتێبی (الجامع لأصل ) لە بەرگی پێنجەم، کە باسی ڕووداوەکانی پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت ئەکات، زۆرێکی بە نصوص باس کردووە، بە باس و بە وێنەو بە نموونە، کە بە گشتی بریتییە لە: (هَرَجَ وَمَرج) فیتنەو بیٚ ڕەحمی و ئینحیراف و لادان و خزاندنی مرۆڤ و دوورکەوتنەوەی لە خواو لە بەرنامەی خوا ...

بە گشتی ئەوە نیشانە بچووکەکانیەتی، جا (إنشاءَ الله ) لە دەرسەکانی داهاتوودا ئاماژە ئەکەین بۆ نیشانە گەورەکان، کە ئیتر نیشانەی گەورە ئەوەیە کە لە گەڵ ڕوودانیان دا ڕاستەوخۆ ڕۆژی دواییە، بەس نیشانە بچووکەکان فەرقەکەیان ئەوەیە کە هەرچەند بچووکن، زۆرێکی پیٚ ئەچێت ئەوجا قیامەت دێت ...

بۆ نموونە: هاتنی پێغەمبەری خواو ﷺ و بوونی بەپێغەمبەرو ، وەکو ئەزانین ئەوە یەکێکە لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، بۆیە پێی ئەوترێت محمد پێغەمبەری ئاخیر زەمانە ﷺ ، بەڵام لە بەینی هاتنی ئەو و هاتنی ڕۆژی قیامەت دا دەیان و سەدان و هەزاران ساڵی پیٚ ئەچێت، کەواتە لە بەینی هەر نیشانەیەك و نیشانەیەکی تر پیٚ ئەچێت و ئەگونجێت هەزاران ساڵی پیٚ بچێت، بەڵام هەر پێی ئەوترێت نیشانە بچووکەکانی ڕۆژی دوایی ...

نیشانە گەورەکان لەگەڵ هاتنیان یەك لە دوای یەك، کە تەواو بوون دە نیشانەن تەقریبەن، ئیتر ڕۆژی دوایی یەکسەر دێت و هیچ زەمانێك نامێنێت و هیچی پیٚ ناچێت ..

إنشاءَ الله دەرسی داهاتوو باسی نیشانە گەورەكانی ڕۆژی دوایی ئەكەین ، تا ئەو كاتە هەمووتان بەخوای باڵادەست ئەسپێرم خواتان لەگەڵ ..

وَالسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُه ...

# ﴿وتاری ... باوەڕ بە ڕۆژی دوایی ..٢﴾

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ... الحَمْدُ للهِ رَبِ العالَمينْ وَالصَلاةُ وَالسَلامُ عَلى سَيدِنا محمدٍ إمامِ المُتقينْ وَعلى آلِهِ وَصَحبِهِ وَمَنْ دَعى بِدَعوَتِهِ إلى يَومِ الدينْ ... وَالسَامُ عَلَيكُمْ وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ ..

**خوشك و برا ئازیزەکانم: سەلام و ڕەحمەتی خوای گەورەتان لیٚ بیٚت، ئەوا جاریٚکی تریش بە خزمەتتان ئەگەینەوە بۆ دریٚژەدان بە باسی هاتنی ڕۆژی دوایی و ڕووداوە سەختەکانی ئەو ڕۆژە، لە دەرسی پیٚشوودا باسیٚکمان کرد کە چۆن دونیا تیٚك ئەچیٚ و چەند نیشانەیەك دیٚنە پیٚش، دوای ئەوانە ئیتر ڕۆژی دوایی دیٚت و ئیسرافیل فوو ئەکات بە نەفخی سورا(کەڕەنا) کە ئەمری پیٚ کراوە، کە ئەوەش ئیتر نیشانەو ئیشارەیە بۆ ئەوەی کە ئیتر ئەم دنیایە ئەپیٚچریٚتەوەو ڕۆژی دوایی دەست پیٚ ئەکات، خوای گەورە باسی ئەو دوو فووە ئەکات کە ئەکریٚت بە کەڕەنایا ، یەکیٚکیان بۆ کۆتایی ژیانەو دووەمیشیان بۆ زیندوو کردنەوەی هەموو گیانلەبەرەکانە کە خوای گەورە لە دونیادا**

دروستی کردون و ئیمتیحانی کردوون و ئەفەرموێت: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُورِ فعق مِن فِي السَموات وَمن فِي الأرض إلا مَنْ شاءَ اللّهَ ثُمَ نُفِخَ فيهِ أُخرى ..فإذا هُمْ قِيامُ يَنظُرونْ وَاشرقَت الأرضُ بِنورِ رَبِها وَ وضِعَ الكِتابُ وَجِيءَ بالنَبِينَ وَ الشُهَداءِ وَ قُضيَ بَينَهُمْ بالحَقِ وَهُمْ لا يُظْلِمونْ .. وَوُفِيَتْ كُلُ نَفسٍ ما عَمِلَتْ وَهُوَ اعْلَمُ بِما يَفعَلونْ﴾ ...

بەم شێوەیە دونیا کۆتایی دیت و دونیایەك و جیهانێکی تر دروست ئەبێت و دەست پێئەکات ...

ئەوجا کافرەکان کاتێك کە زیندوو ئەکرێنەوە ، ئیسرافیل فووی دووەمی ئەکات بە کەڕەناکەیدا، ئەو کاتە کە لە دونیادا کافرەکان ئەیانوت زیندوو بونەوەی چی ؟ ﴿مَنْ يُحِي العِظامَ وَهِيَ رَميمْ﴾

بەیەك دەنگ و بەیەك ڕەنگ هاوار ئەکەن و ئیعتراف ئەکەن و ئەڵێن: ﴿ياوَيلَنا مَنْ بَعَثَنا مِنْ مَرقَدنا هذا ما وَعَدَ الرَحمنُ وَصَدَقَ المُرسَلونْ﴾ ...

ئەو کاتە ئەزانن کە قۆناغ لە کوێیەو بێدار ئەبنەوە، وە دان ئەنێن بە ڕاستییەکان دا و ئەڵێن: ﴿يا لَيتني قَدَمتُ لِحَياتي﴾ .. خۆزگایە شتێکم پێش خستایە بۆ ئەم ڕۆژە

سەختە، ئەوجارە هەموو ڕاستییەكان دەرئەكەون و هەموو درۆو دەلەسەكان ڕوون ئەبنەوە، وە هەموو كەس تێئەگات كە ڕۆژی ژیانی ڕاستی و ڕۆژی ڕاستەقینەو ژیانی ڕاستەقینە لێرەدایە .

كەوابێ بەچی ڕۆژی قیامەت دەست پێئەكات، فووی دووەمی ئیسرافیل بە كەڕەناكەدا، دووەم هەڵوێست كە ڕوو ئەدات لە دوای فوو كردنەكەو تێك چوونی دونیاو زیندوو بونەوەی هەموو مردووەكان بۆ حەشر، هەنگاوی دووەم و ڕووداوی دووەم حەشرە، حەشر چییە ؟ یەعنی كۆبونەوەی هەموو دروست كراوەكانی خوای گەورە لە ئادەمەوە هەتا دواین كەس لە یەك ساحەداو لەیەك جێگای بەرین و دورودرێژدا، مەگەر خوا خۆی بزانێ چۆنەو لە كوێیە، خوای گەورە ئەوڕۆژەی ئامادەی ئەكات، ﴿يَومَ تُبدَلُ الأرضُ غَيرَالأرض﴾ زەوییەكی تر دروست ئەكات كە وەكو لە (نصوص)و ڕیوایەتە صەحیحەكان دا هاتووە، لە وڵاتی شامەوە ، زەوییەكی سپییەو جێگەی ئەو هەمووەی تیا ئەبێتەوە، لەوێ خوای گەورە حكوم ئەكات لە بەینیانا ، ﴿يَومَ

نَحشُرَ المُتَقِينَ الى الرَحْمنِ وَمذا وَنُسُوقُ المُجرمِينَ إلى جَهَنَمَ وِرداً﴾ ...

جا چارەنوسی پیاوچاکان بەڕێزو ئیحترامەوە حەشر ئەکرێن، کافرەکانیش وەکو ئاژەڵ هاواریان لێ ئەکرێ و ئەدرێنە بەر ...

سێهەم : لەو ڕوداوە سەختانەی کە ڕوو ئەدەن پاداشتە لەسەر کردەوەکان ، پاداشت و تۆڵەیە لەسەر کردەوەی چاك و خراپ، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَنْ جاءَ بالحَسَنَةِ فَلَهُ خَيرٌ منها وَمَنْ جاءَ بالسَيئَةِ فَلا يُجزى الذينَ عَملوا السَيئاتِ إلا ما كانوا يَعْملونْ﴾ ..﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ۝ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ﴾

ئابەو شێوەیە لەو شوێنەدا حەشر ئەکرێن، ئەو هەموو خەڵکە بە ڕووتی ، بە پێخاوسی، بەسەری ڕووتەوە، لە حاڵەتێکی زۆر خراپ دا، تۆڵەو پاداشت وەرئەگرێتەوە، وە هەر کەسەو بەگوێرەی کردەوەکانی خۆی کە لە دونیادا ئەنجامی داون، چاکی کردبێت ، چاك دێتەوە ڕێی و چاکە ئەدورێتەوە، خراپی کردبێت خراپە ئەدورێتەوەو خراپە

دێتەوە ڕێی ، بەڵام لەوکاتی حەشرەدا کە لە هەمووی سەختترە، پلەو گەورەیی پێغەمبەری خوا ﷺ ﴿رَحمَةً للعالَمينْ﴾ دەرئەکەوێت، کە هەموو عالەم کۆ ئەبنەوە بە پێغەمبەران و پیاوچاکان و پیاو خراپ و کافرەوە هەموو هاواریان لیٚ بەرز ئەبێتەوەو هەموویان لە عەرەقی خۆیان دا نقوم بوون، چونکە خوای گەورە ڕۆژێك دروست ئەکات کە لەسەر ئەو زەوییە تایبەتە سپییەیە کە ئامادە کراوە بۆ حەشرو کۆبونەوە، لەویٚ تیشکی ئەو خۆرە هێند نزیك ئەبێتەوە تاوای لێدێت تەنها میلێك لە زەوییەوە دوور ئەبێت، ئەوجا هەموویان هاواریان لیٚ بەرز ئەبێتەوەو ئەڵێن بەڵکو ڕزگارمان بێت لەم دانیشتن و ڕاوەستانە، ئەگەر بۆ دۆزەخیشمان ببەن هەر قەیناکا، بەمەرجێك لەم وەزعە ڕزگارمان بێت، ئەوجا پەنا ئەبەن بۆ پێغەمبەرەکان ، بەڵام پێغەمبەران هەریەکەیان بە جۆریٚ عوزر دێننەوەو ناتوانن شەفاعەت بکەن، تا ئەچنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، جا خوای گەورە لەبەر ئەوەی کە (الوسیلە)و مەقامی مەحموودی داوەتیٚ، ئەو کاتە شەفاعەت ئەکات و لەو ڕاوەستانی حەشرە

ڕزگاریان ئەبێت، ئەوجا کردەوەکان و پاداشت و سزای کردەوەکان کە کرداری سێهەمە دێتە پێشەوە ....

چوارەم ڕووداو پێی ئەوتریٚ پیشاندان وحیساب کردن.. ﴿يَومَئِذٍ تُعْرِضونَ لا تَخفى مِنكُمْ خافية﴾ ...

لە زۆر ئایەتا خوای گەورە باسی (یوم العرض) ئەکات کە هەموو کردەوەکان و خەڵکەکان هەمووی ئەخرێنە بەر چاو و هەمووی ئەبینرێت .. ﴿يَومَ تُبلى السَرائِرْ﴾ ..

پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی نواندنی کردەوەکان وحیساب لەگەڵ کردن بەچاکەوخراپە، ئەفەرموێت: ﴿مامِنكُمْ مِنْ عَبدٍ إلا سَيُكلمَهُ اللهُ يَومَ القيامةِ لَيسَ بَيْنَهُ وَبَينها تَرجمانِ ثُمَ يَنظُرُ أيمَنه فَلا يُرى شَيئاً ثُمَ يَنظُرُ اشْأَمَه فَلا يَرى شَيئاً ثُمَ يَنظُرَ بَينَ يَدِهِ فَلا يَرى إلا النار﴾ ..

فەرموودەی زۆر هەیە دەربارەی حیساب لەگەڵ کردن، لەبارەی کردەوە نیشان دان، ئایەتو حەدیثمان زۆرە ، کورتەکەی ئەوەیە کە هەموو کەسەکان نیشان ئەدرێن و هەمووی دەرئەکەون و ئەوەی نهێنی بووەو ئەوەی بە دزی کراوە، ئەوەی لە ژێر پەردەوە کراوە لە چاکەو لە خراپە هەمووی دەرئەکەوێت لەو کاتەدا، وە خەڵکانیش ئەیبینن و

خواو مەلائیکەتەکانیش ئەیبینن، وە کابرای خاوەن چاکەو خراپەکەش خۆی کردەوەکانی خۆی ئەبینێت، ئەوجا بەلای ڕاست دا سەیر ئەکات، خوای گەورە لەگەڵ یەکێك لە عەبدەکانیدا قسە ئەکات، هەندێکیان چپەیان لەگەڵ ئەکاو ئەفەرموێت: عەبدەکەم بیرت دێت فڵان خراپەت کرد لە دونیادا ؟ ئەویش ئەڵێت: ئەی خوای گەورە بیرم دێت، ئەفەرموێت: ئەی من چیم کرد لەگەڵت ؟ ئەویش ئەڵێت : خوایا داتپۆشیم و حەیات نەبردم و ڕوو ڕەشت نەکردم، کە ئەگەر حەیات ببردمایە کەس سەلامی لێنەئەکردم و کەس قسەی لەگەڵ نەئەکردم، پاشان خوای گەورە ئەفەرموێت: ئەی چی ئەڵێی ئەگەر ئێستا سەترت کەم و داتپۆشم و شەرمەزارت نەکەم ؟ ئەویش ئەڵێت: یاڕەبی ڕەحم و بەزەیی و میهرەبانی هەر لای تۆیەو منیش عەبدێکی تاوانبارو گوناهبارو موحتاجی تۆم ، ئێستاش لێم ببورەو داميۆشە با حەیام نەچێت لەناو ئەو هەموو حەشامات و لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا، خوای گەورەش لوتف و ڕەحمی لەگەڵ ئەکات و دایئەپۆشێ و ئەفەرموێت: ئێستەش دەنگ مەکە با کەس نەزانێت ئەوا من لێت ئەبوورم ...

جا مرۆڤ ئاوڕ ئەداتەوەو سەیر ئەكات لای ڕاستی هیچ نابینێ و لای چەپی هیچ نابینێت و لەبەر دەمی خۆی هیچ نابینێت جگە لە ئاگری دۆزەخ ...

گرنگی و سەختی ئەو ڕۆژە سەختە هەموو هەنگاو و هەڵوێستەكان و ڕووداوەكان هەمووی سەختە، پێغەمبەری ئازیز ﷺ ئەفەرموێت: ﴿لَيسَ احدُ يحاسَب إلاّ اهلَك﴾ .. ئەمجا ئەفەرموێت: ﴿مَنْ نوقِشَ الحِسابُ عُذِبْ﴾ هەركەسێك خوا حیسابی لەگەڵ بكات توشی سزا ئەبێت، ئەوەتا لەو ڕۆژەدا خوا ئەفەرموێت:﴿وكُلَ إنسانِ الزَمناهُ طائِرةُ في عُنُقهِ ونخرجُ لَهُ يَومَ القيامةِ كتاباً يَلقاهُ مَنشوراً .. إقرَا كتابَكَ كَفى بِنَفسِكَ اليَومَ عَلَيكَ حَسيبا﴾ ..هەروەها ئەفەرموێت: ﴿ونَضَعَ المَوازينَ القِسطِ لِيَومِ القيامةِ فَلا تُظلمُ نَفسٌ شَيئاً وإنْ كانَ مِثقالَ حَبَةٍ مِنْ خَردَلٍ اتينا بِها وكَفى بنا حاسبَينْ﴾ ...

ئایەت و فەرموودە زۆرە ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە موسوڵمانەكانی هان ئەداو بیری ئەخستنەوە كە خۆیان ئامادە بكەن بۆ ڕۆژی عەرزو ڕۆژی حیساب، ئەو كاتە بە قەدەر مسقاڵە زەڕڕەیەك شت وون نابێت و هەمووی حیسابی لەسەر ئەكرێت، هەمووی دێنێتە پێش چاو و خوای گەورە

هەرکەسێك موحاسەبە بکات سزای ئەدات، خوای گەورە لە بەشێکی زۆر لە عەبدەکانی خۆش ئەبێت و ئەیانخاتە بەر شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ و ڕەحمیان پێئەکات، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك خوا لیی بپرسێتەوە ئیللا ناجیح نابێت، تاقیکردنەوەکەی هەم سەختەو هەم پرسیارەکانی زۆرن، خەڵکەکەش هەم گوناهبارەو هەم بەگوێرەی شەرع نەجوڵاوەتەوە ، کە ئەگەر بێت و خوا موحاسەبەیان بکات، کەس لە موحاسەبەی خوا دەرناچێت .

ڕووداوی پێنجەم کە دێتە ڕێگەی عەبدەکانی خوا، حەوضە، حەوضی پێغەمبەر ﷺ کە ناوی نراوە.

(الحوض المورود) ئەوەش یەکێکە لە کەرامەت و موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ ، یەکێکە لە حورمەت و ڕێزی ئوممەتەکەی ، کە پێغەمبەر خۆی فەرموویەتی: ﴿أنا فَرطُتكُمْ إلى الحَوض﴾ من ئیمام و شارەزاتانم و بانگتان ئەکەم بۆ سەر حەوزەکەم کە خوا پێی داوم، ﴿فَمَنْ وَرَدَ شَرِبَ فَمَنْ شَرِبَ لَمْ يَضَأ ابَداً﴾ .. هەرکەسێك دێتە سەر حەوزەکەی من ، وە دێت بەدەم ئەم بانگەوازی منەوە، لە مشتی من ئاوێك ئەخواتەوە، ئیتر دوای ئەوە ئاوی خواردەوە هەرگیز تینووی نابێت،

ئەچێتە سەر حەزەکەو ئەمجا یارەکانی خۆی و ئوممەتەکەی خۆی بانگ ئەکاو ئەفەرموێت: ﴿هَلُمَ إلَي﴾ جا لەوکاتەدا هەموو موسوڵمانەکان هێرش ئەکەن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی لە مشتی موبارەکی ئەو ئاو لە حەوزی کەوسەر نۆش بکەن، لەو کاتەدا هەندێ مەلائیکەت هەڵمەت ئەدەنە سەر موسوڵمانان لە ئوممەتەکەی پێغەمبەر ﷺ و ناهێڵن بچن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەریش ﷺ هاواری لێ بەرز ئەبێتەوەو ئەفەرموێت : لێیا گەڕێ با بێن، ئەوجا خوای گەورە بە مەلائیکەتەکان ئەفەرموێت: بە (محمد) بڵێن تۆ نازانی ئەمانە لە دوای وەفاتی تۆ چۆن پاشگەز بونەوە لە ئیسلام و پشتیان لە دینەکەی تۆ کرد، چۆن بێ وەفا بوون و چۆن لەسەر ڕێ و ڕێبازی تۆ لایان داو چۆن بوون بە جولەکەو گاورو چۆن بێ دین بوون و ڕوویان کردە ئەملاو ئەولاو پشتیان کردە ئیسلام، تۆ نازانی لێیان گەڕێ ، جا پێغەمبەر ﷺ پێیان ئەفەرموێت: ﴿سُحقاً سُحقا﴾ .. کەواتە دوریان بخەنەوە ، ئەوانەم ناوێ حاشا لە ناو چاوانیان ئەوانە ئوممەتی من نین، (نعوذُ بالله) لە خەجاڵەتی ئەو ڕۆژە، ئەو کاتە ئەزانن کە بێ پێغەمبەری چەندە خەتەرە، وە تەنها

پێغەمبەر ﷺ شەفاعەت ئەخوازێت بۆ پێغەمبەرەكانی ترو بۆ ئوممەتەكانی تریش، وە كەس تواناو دەسەلاتی ئەوەی نییە، ئەو كاتە ماڵ وێرانی دەرئەكەوێت بۆ ئەوانەی كە پشت ئەكەنە ئەو پێغەمبەرەو ئەو دینە پیرۆزەی...

**شەشەم** : لەو پێش هات و ڕووداوانە: (میزانە)، واتە خوای گەورە شایان و تەرازووێك دائەنێت بۆ كێشانەو پێوانەی كردارو كردەوەی ئەو كەسانە چ چاك و چ خراپ، هەموویان خوای گەورە ئەیانكێشێت، ئەوەیە كە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَنَضَعَ المَوازِنَ القِسطِ﴾ ..هیچ كەسێك ستەمی لێناكرێت بە میزانێكی دادگەر كە هیچی لیّ ون نابێت.

﴿مالِ هذا الكِتابِ لا يُغادِرُ صَغيرةً وَلا كَبيرَةً إلا أحصاها وَوَجَدوا ما عَمَلوا حاضِراً وَلا يظلَمُ رَبُكَ أحَداً﴾ ..

بەو شێوەیە كێشانە ئەكرێت بۆ كردارو گوفتارەكانمان چ خراپ و چ چاك .

حەوتەم ڕووداو و پێش هات كە ڕوو ئەدات پردی (صیراط)ە، كە پردێكە لەبەینی بەهەشت و جەهەننەم دا ڕاكێشراوەو زۆر زۆر باریكە وە زۆر زۆر تیژە، وەكو لە

فەرموودەدا هاتووە، دوای حیساب و میزانەکان ئەمجا ئەم پردی صیراطە ڕائەکێشرێت و ئەبێت هەموو کەسێکیش بڕوات بەسەریدا، تەنانەت ئەگەر پێغەمبەرو ئەولیاو شەهیدو پیاوچاك و پیاو خراپیش بێت، هەمووی ئەبێت بەسەریدا بڕوات وەکو چۆن هەمووی لە ساحەی حەشردا کۆئەبنەوە، جا هەرکەسێك بە سەلامەتی پەڕییەوە ئەچێت بۆ بەهەشت، بەڵام خوا پەنامان بات هەر کەسێکیش کەوتە خوارەوە ئەچێت بۆ دۆزەخ ، پێغەمبەری خوا ﷺ باسی پردی (صیراط)مان بۆ ئەکات و ئەفەرموێت: هەندێکیان کە کردەوەکانیان زۆر باش وچاکن وەکو برق بەسەریدا تێدەپەڕن و وەکو تیشك و خێرایی تیشك ئەپەڕنەوە، هەندێك وەکو با، هەندێك بە ڕاکردن ، هەندێك بە ڕۆشتنی ئاسایی، هەندێك بە گاگۆڵکێ و چنگە خشێ ئەڕۆن، ئابەو شێوەیە ، لەو کاتەدا مەلائیکەتەکان دوعا ئەکەن بۆ موسوڵمانەکان وئەڵێن:﴿اللهُمَ سَلَم .. اللهُمَ سلم﴾ خوایە بیانپارێزی و بە سەلامەتی بپەڕنەوە، ئەوەتا قورئانی پیرۆز باسی پردی صیراط ئەکات و ئەفەرموێت:﴿وَإنْ مِنكُمُ الاّ وارِدُها كانَ عَلى رَبَكَ حَتماً مَقضِياً﴾ .. هەموو کەس ئەبێت بەسەر پردی

صیراط دا بڕوات، هەموو کەس ئەبێت ئەو تاقیکردنەوە سەختە ببینیٚ وە بچێتە ناو ئەو تاقیکردنەوە سەختەوە، ئەمجا لەدوای پردی صیراط ئاخر قۆناغ کە دێت ﴿فَرِيقٌ فِي الجنة وَفَرِيقٌ فِي السَعِير﴾ بەهەشت و جەهەنەمیش خوای گەورە خۆی دایناوە، کەبەهەشت نیشانەی رەحمان و رەحیمیەتی وە جەهەنەمیش ئاکاری جەباریەت و موتەکەبیریەت و (شدیدالعقاب) لە دۆزەخدا دەردەکەوێت، بەهەشت پاداشتە بۆ ئەو چاکانە ﴿أُعِدت للمُتقِين﴾ جەهەنەمیش ئامادە کراوە بۆ پیس و بیٚ دینەکان و زیناکەر و پیاو کوژو دزو جەردەکان ئەوانەی کە دوای هەواو ئارەزوی شەیتان کەوتون و دوای پەیامی ئەو پێغەمبەرە نازدارو شیرینە نەکەوتون ﴿هذه جَهَنمُ التى كُنتُم تُوعَدون﴾.....

جا دوای ئەوە ئاخر قۆناغ دێت و مردن دەهێنن و سەری دەبڕن بەخەڵکەکە دەڵێن خەڵکینە ئەوا مردن نەما، مەلائکە هاوار ئەکەن ئەڵێن: خەڵکینە ئەوا مردن سەربڕا ئیتر هەتاهەتایە یان خۆشی ولەزەتە لە بەهەشتدا یان نارەحەتی و پوورەشی و خەجاڵەتیە لە دۆزەخدا.

ئیتر بەم شێوەیە کۆتای دێت بەهەڵوێستەکانی ڕۆژی قیامەت وە (خلود) دەست پێئەکات واتە: نەمری مرۆڤ دەست پێئەکات چ لەبەهەشتدا چ لەدۆزەخدا، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿خالدِينَ فيها أبداً﴾ ئیتر لەویا بەتەواوەتی جێگیر ئەبێ و مرۆڤی موسولمان بۆ هەمیشەو هەتا هەتایە لەبەهەشت دا ئەمێنێتەوەو لە نازو نیعمەت و ڕابواردن دا ئەبێت، ئەو بەهەشتەی کە قورئانی پیرۆز بە دوورو درێژی باسی ئەکات و لە حەدیثی قودسیدا باسی ئەکات : ﴿أُعدِدتُ لِعِبادِيَ الصالِحِينَ مالا عِينٌ رَاتْ وَلا أُذنٌ سَمعَتْ وَلا خَطَرُ عَلى قَلبِ بَشَرْ﴾ ..

جەهەننەمیش بەهەمان شێوە قورئانی پیرۆز زۆر ڕەسمی لێ گرتووەو نموونەی لێهێناوەتەوەو باسی کردووە..

یارەبی خوایە بۆ خاتری ناوە پیرۆزەکانت هیدایەتمان بکەو سەرکەوتوومان بکە بۆ هەر گفتارو کردارێك کەوا ئەمانگەیەنێتە بەهەشت و ڕەزامەندی خوا، وە بشمان پارێزە لە هەر هەم و گرفتارو کردارێ کە ڕوو ڕەشی لای خوامان ئەکات و ئەمانبات بەرەو دۆزەخ ....

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

## پێرست